





کەژاڵ ئەحمەد

# بەندەری بەرمۆدا

چاپی یەکەم و دووەم
1999



## لەمریەم بەڕەحم تر

«ئەی مریەمەکانی وڵاتەکەم ئەو ساتانەی
مەرگ دەبێتە پێویستییەک با یەکەمجار
ئێمەی دایک پێشوازیی لێ بکەین نەک
ڕۆڵەکانمان»







گەل تەنیایە!

وەک تەنیایی بابە ئادەم

بەرلەهاتنی بەفەڕی دایە حەوا

گەل تەنیایەو

منیش ... تەنیام

قارچکی بێزاریی لەدڵم هەڵتۆقیو

بێزار نەبووم

نانی پێکەنینی گەرمم کەڕوو لێیدا

وەک دووگیانیش بووم ئەی شاعیر

نەکۆرپەی شیعرم لەبارچوو

نەخۆم لەباری شیعرچووم.

مەسیح کەی دێ ؟!



وا لەپردی سیراتی چاوەڕوانییەوە

کەوتمە خوارێ

لە دیری عەشقو شیعردا هێندە گریام

رۆخی جۆگەلەی فرمێسکم قەوزە گرتی

بەبێ شیعریش هەر چاوەڕێم

چاوەڕێی رێم

چاوەڕێی تۆم

بێ پەروا ئەدوێمو

هەرگیز لام روون نییە

باسی زەمینت بۆ ئەکەم

یان باسی خۆم.

پاش هێڵنجێک

پارچەیەک نور بووی لەدەمی

زامەکەی دەممەوە رژایت

نەزیفی وشەی دوای بوونت بەرینەدام

خوێن کردمی بەشاعیرێک

یان مریەمە شاعیری شێت.

هاتم پردی بەخشینم بەست

بۆ نێوانی خاکی دڵمو

ئاسمانەکەی کاسەی سەرت

لێ رۆشتنم بەردەوامە

بڵێی بۆ ئەبەد لێم بڕوات ؟!

تۆ نەبوو بوویت

خاچ کون بەکون بۆتدەگەڕا

بمزانیایە ناتوانێ بەرەحم بێ بۆت

لەگەڵ لەدایک بوونتدا ئەموت: وەرە

بگەڕێرەوە ناو جەستەی پڕ لەئارامیی دایکی خۆت!

بمزانیایە ناوت لێ ئەنێن (کوڕی خوا)

نەمدەهێشت بێیت







کەهیچ شەوێ من نەنووستبم لەگەڵ خوا

ئەو نابێتە باوکی کوڕو

کەباخەڵی ئەوم دیبێ

بۆ ناوم لێ بنرێت ( عذاء)

***         ***         ***

نوری دیدەم

تۆ خۆت بڵێ

من بێگەردترم یان مریەم؟!

من عاشقترم یان مریەم؟!

زامی دڵی من گەورەیە

یان خەمی ئەو؟!

من هیچ ناڵێم، تۆ خۆت بڵێ

نوری دیدەم.

خونیاگەرە عاشقەکە...*





عیساکەی خۆم

پێم مەڵێ مریەمی شاعیر

ئەرۆشێم، دڵگران ئەبم

من لەدایکایەتیما زۆر

لەمریەم بەرەحمترم

من و مریەم ...

جیاوازیمان لەوەدایە

کوێربم ناتوانم چاولێکنێم

تا بەژیانم ژیانت نەکرمەوە

لەکونجوری قەناعەتدا هەڵناکورمێم

تا لەبری تۆ بەسەر خاچدا دانەکوترێم.

جیاوازیمان لەوەدایە

من وەکو ئەو ناتوانم بتدەمە دەست خوایش

دڵم نایەت

ئاخر خواوەند دایکایەتی نەبینیووەو

بۆتناسوتیێو دەربەستی سک سوتان نایەت.



دایکایەتی خەمێکی ئێجگار گەورەیە

من بووم بەدایک

بەرلەئەوەی ببم بە ژن!!

کە مەسیحم خوڵقاندبێ دەربەستنایەم

ئەگەر چەقۆم لێ بکێشن و

گومان لە کچێتیم بکەن!!

مەسیحی خاک ...

مەسیحی باوک ...

من بۆیە هەم، دنیا بەدرۆ بخەمەوە

چاوەڕێی مردنت ناکەم

هەر ئەمجارە ... تاقانەکەم

لەبری گیتارە غەمبارە پرچ سپییەکەت

تەرمی دایکت لەباوەشنێ

باش دڵنییام پێش تۆ ئەمرم

ناگەمە ئەو کاتەی کۆشم

دوورba- مەرگی تۆ ببینیٚ.

1990- کەلار

*خونیاگەر: گۆرانییێژ











## جیابوونەوە لە زەوی

کەتەقیمەوە

وەک هێڵی ئیستیوا پرچم

بووبە پشتێنی کەمەری زەوی!

بۆ بەستەڵەکی خوارووش خۆم کردە

جووتیٚ گۆرەوی

لەداوی رۆحم بۆ بەستەڵەکی

ژوورو کلآوو جامانەم چنی

خاک لێم بێزاربوو

ویستی داماڵیٚ وەکو پاڵتۆی کۆن

خۆم بەرِحمەتی ریشتا هەڵواسی

لەتۆپی زەمین بەرتدامەوە باوەشی گەردوون





هەر لەئاسمانا بووم بەئەستێرە

ئێستا مەدارو عەشقی خۆم هەیەو

لەزەویش زیاتر خەڵکم تیا ئەژی!

1990- کەلار



**خاڵی گومان**

ئاواتی من گەررەترە

لەوەی بەتەنیا ئافرەتبم

یان شاعیربم یان شای ژنان

ئەگەر ناوبانگیشم بفرێ لەمپەڕ تا ئەو پەڕی جیهان.

هەرچەندە بیر ئەکەمەوە

خەونەکانم باڵاترن لەو سنوورو نەریتانەی

لەم دنیا بۆم دانراون

لەو نەخشانەی لەئەو دنیا بۆم کێشراون

گەورەترن لە وشەی ژەنگگرتووی ئەوان.

زۆر جار لێکی ئەدەمەوە

بڵێی ئاسایی بێ کچان

ژیانیان هەر شووکردن و مناڵبوونە

دەبنە خزمەتکاری رۆژو چێژی شەوان؟!

ساڵی تەمەنم نزیکە لەوەرزی شووکردنەوە





تۆبڵێی خۆمبگرم یەزدان

لەبەر خەنجەری سەرنجی خەڵکی کۆمەڵگای بێ ویژدان

ئەو خەڵکەی کەرِسواتئەکەن

ئەگەر نەبووی بەبووکی شاییو لۆغانیان.

تۆ بڵێی شەریعەت بەس بێ

ئەی دەزگیران

بۆئەوەی من لەیەک شەوا

کچێنی خۆم بدۆڕێنم

لەناو نوێنی ژووری خەوا!

ئەی مارەبڕ، ئەی مامۆستای سەرلێشێواو

ئەگەر ئەتزانی کچێنی لای ئافرەتی ئێمە چییەو

چۆن پارێزگاریی لێ ئەکرێ

ئەتزانی بۆ ئاسان نییە لەدەستبدرێ

گرانەو گەلێکیش گران ...

تۆبڵێی دڵم نەوەستێو



لەشەرمانا نەبم بەپاچەیەک گریان

ئەوساتانەی رووسورییەکەم

بەسەر دەستی مێردەکەمو

ژمارەیەک پیرێژنەوە ئەبینم

ئەیگەرِێنن کوڵان کوڵان.

هەموو کاتێ من لەسەر خاڵی گومانم

من شەرەفی پیاوەکەمم بەڵام ئەو شەرەفم نییە

من لەپەراسووی چەپمو من شەیتانم

بەریشی کامتان رەوایە

شەپۆلبمو شەپۆل نەبم ئەی دەریاکان

مرۆڤبمو مرۆڤنەبم

گرانەو گەلێکیش گران.

کەباڵندەی هیواکانم باڵەکانیان ئەکەنەوە

ئەم گەردوونە تەسکە لایان

چۆن قایلبم بەو یاسایەی

لەلای تۆ ئەمکاتە بتی رابواردنو

پیاداهەڵدان

ئەی هاوڕێ گیان

چۆن بارانی خۆشەویستیم لا مەزن بێ ؟!

ئەگەر زەویو ئاسمانو کەش

بەدابارینی نەگۆڕان

چۆن گەشبین بم؟!

ئەگەر جوانیی لەسەوزایی چاوی دڵدارەکان تۆران

چۆن نەترسم لە دامێنم، لە سێبەری

کورتو درێژی بالأمان

تا لەگەرمەی دەستگوشینا

ئەم دیوارانەی نێوانمان

نەیەنبەچۆکداو نەکەون

ئەی هاوڕێ گیان.

1990- کفری







## دایکانە

(کەبستێ خاک نەمایەوە شەهیدی

تێدا بنێژرێت، ئەوسا دەبێ دایکان

ببن بەگۆڕ، بۆ تەرمی رۆڵەکانیان )

لەمردن مۆڕ ئەبمەوە

وەک راپەڕین

بەسەرسامیی ئەڕوانمە شەهیدستانی زێدەکەم

نەخەوە نەخەون بینین!!

بەبەرچاوی رۆحمەوە

تەرمی کوڕەکەم ئەخەنە بیری کەنعانی تابووتو

بەشانە ڕەقەڵەکانیانهەڵیدەگرن

دەکەونەرێ



بەپێ خواسیی لەدوویان دێم

لەحەسرەتا

وەک سەرپۆشی دایکی شەهید

رەش رەش، رەش رەش دادەگەڕێم

هێشتا وەک دایکانی دنیا

دەستبەرداری مافی خۆم نیم!

-ئادەمەکان کورتان نەمرێ

ئەو عەزیزەم وامەنێژن رێی تێناچێ

ئەمە جەورە

-حەوا سەر شینەکانی کورد، ئادەمەکان

رێی تێناچێ ئەمە زۆرە

ئەگەر زەوی ئولکەی *رەحمم



سەرەتای ژیان‌و بوونی رۆڵەکەم بێ

لەپای چی بیسپێرم بەخاک؟!!!

ئەی بۆ گۆڕو گۆڕستانیشی لەجەستەی

خۆمدا نەبێت؟!

بۆچی نابێت؟؟؟

1991- سلێمانی





**دوو کورسی**

1- ...........

**هاوەڵانی نەهامەتیم**

**نە بەمەستی، نە بەماتی**

**گوێناگرن لە گۆرانییەک**

**هەنیسکم مۆسیقایەتی**

**لەگریاندا پێئەکەنم**

**تا لەقاقاما کارێزی فرمێسکی سوورم ئەتەقێ**

**لەپێکەنیندا ئەگریم، تا شێت ئەبم**

**تا جیاوازیی نێوان بەختیاریو بەدبەختیم**

**لێتێک ئەچێ !!!**

**وەک گەشبینیی،ئەگەر هاتی**

**دەشێ بڵێم:چیت لێم ئەوێ ؟!**

ئەوەتانێ کابرایەکی ڕۆژهەڵاتی

لەسەر کورسیی حەیاو ئابڕوم دانیشتووە

قاچی خستۆتە سەر قاچی

لەپێیەکدا سەدجار ئەڵێ بەشەرەفم!

ئای لەشەرەفی رزیوی کابرایەکی ڕۆژهەڵاتی !!!

2- ..........

سەرم قورسە

بەسەر ئاسماندا دەڕۆم و تۆپی زەویم

بەم سەرە بچکۆلانەیەم هەڵگرتووە!

هەستئەکەم سەرم کورسییە

بەسەر زەویدا دەڕۆم و

(ئەو) لەسەر تەوقی سەری من دانیشتووە!!

کورسی زێڕە؟!







یان یەک پارچە تووکی قووە؟!

من نازانم هێندە نەبێ

قاچەکانی تاپەردەی ڕوحم ڕۆچووە

وەک لەسەری دانەنیشتووم

وەک بۆم ناشکێ

ئەو تێک و پێکی شکاندووم

ئەو لەسەر من

دانیشتووە !!!

15 /1 /1991- جەلەولا

* لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) دا بلاوکراوەتەوە.

## خەمی قەلا

( رووبار گەنجێکی هەمیشە شۆخی

کوردستانە، چونکە لەنزماییەوە ئەڕوانێتە

کارەساتەکان )

دەنگی پڕ حەسرەتی ( سیروان )

لە ( قەلأی شێروانە ) پرسی

رۆڵە گیان خۆ لەچاومن دا

تۆ دوێنێکە لەدایک بووی!

کەچی سەرت کلوی بەفرەو

گۆچان بەپێوە رایگرتووی!!

چ زوو پیر بووی ؟!

بۆچی پیر بووی








ئەی هاوڕێکەم؟!

شێروانە دوو چاوی تەڕی

بڕییە دێی سووتاوی ئەوبەر

ئاوڕێکی بۆ سیروانی شۆخ دایەوەو

وتی: لەعەزرەت گەلەکەم

چش لەپیریش وا شێت ئەبم

ئەی سیروانی وەک کوردستانو

کەلاری کوژراو بێدەنگ

لەگەڵ ئاخم ئاخ هەڵکێشە

ئاخ بۆ ساتێکی راپەڕین

لەسەر گڵکۆی هەر شەهیدێ

لە ملکەچیی هەر بێوەژن،





هەر هەتیوێکی شەوی جەنگ

لە تەوێڵی مێژوو بەقەڵەمی ئێسکـو

بەمەرەکەبی بەحری خوێن

لەڕووخساری هەر وێرانەیەک بنووسن

تەبەد یەدا صدام حسێن.

1991- سلێمانی





## دوا پەرجووی رۆح

رۆحی عاشق

ئارمبوونی دەگمەنە وەک

مەیینی جەستەی بزێوی

دەریایەکی ئێجگار بەستوو

قەناعەتی ساردو سەیرە

وەک دۆڵێکی لەژێر لێفەی

بەفری کیمیایدا نوستوو.

جەستەی عاشق لەرۆشتنا

هەرگیز ناونیشانی وەستان پێنازانیٚ

لەکپبوون و نەنووستنا

سەرما بەگەرما ئەزانیٚ.



*          *          *

رۆحی من ئەسپێکی رەسەنە

مەگیرەم، ئازیزان

بۆ هیچ حزبێک

بۆ هیچ پیاوێک

بۆ هیچ کەسێک

دابین نەبووەو دابین نابیٚ

تا ئێستا سوارچاکیٚ نەبووە

بۆ ئەوی عاشقی باڵدار

دەشیٚ زۆربەیەک شیابن

ببنە مەیتەری سێبەری

بەڵام هێشتا کەس بۆی نەبووە بە شۆڕەسوار !

هەر بۆیە منی بروسکە

تا ئەم عومرە

دەستێک بەر تاڵیٚ لەیاڵی ئەفسانەیی






ئەسپی یاخیم نەکەوتووە.

هەنووکەش بەتەنیا

مۆسیقای حیلەیو پاکیزە غاردانی بۆ ئێوەن

دەنا خۆی، ملی رێی

ئەو جادە پڕ نوورەی عەوێقی ئاسمانی گرتووە

دەنا خۆی بۆ کەس نەبووەو بۆ کەس نییە!!

دەشێ رۆحم بەر سوتماکی ئافرەتانەو

چەخماخەی چیا کەوتبێ

دەشێ جەستەم لەساتۆکەی بەخشینیشدا

ونکردنی گەرمی غرور، جوانی جاویدانەی غروری لا

پەسەند نەبێ.

دواین جاریش

من ئەو هەموو هەڵهاتنو

راکردنو غاردانەم لەبەرئەوەیە

گرتنم گرانو

رامکردنم مەحاڵو



شکانم گچکە بێ

ژیانم پەرجوو بێو

مردنم گەورە بێ.

1992- سلێمانی

* لەگۆڤاری (کاروان) دا بلاْوکراوەتەوە

## نەء

لەناو مندا بچیلێنە

لەگەڵ شەماڵی غروری رۆحدا غاردە ...

بەچی ئەچێ

ئەمە چاخی مێژووی بەردینی ئافرەتە

خۆزگە ئەمتوانی بەقاقای گریان بدوێم

یان بەپرمەی پێکەنین

خۆزگە ئەمتوانی بەڕوانین

زریکە بتەقێنمەوە

سانایە لام نەغمەیەک لەسەرنج دابنێم

سەمایەک لەوەستان دارێژم








بەهێما گۆرانی بڵێم ...

وەلێ گرانە لام بدوێم !!

گرانە هێلانەی زمان

بدەمە وشە باڵندەی دڕو نامۆ

یان بەمارێک لەئەوکمدا

تۆوی هێلکەو زەڕنەقووتە

بێ دایکو باوکەکانی دەنگم بخوا ...

ئاخ ..تەواو پەستم لەدایکم

چەند دڵنیام لەمێیەتی ماکەوەکان

هێندەش گومان ئەکەم لەوەی

کچمان کچ بێو

ژنمان ژن بێ

من ئەڵێم پێ ئەچێ

دایکیشم باوکم بێ !!!

دایکە بابە، پێم بڵێ چی بڵێم؟!





نابینی لەناو وتندا

چۆن گۆشاو گۆش سەربڕاوم

چۆن بەردەوام سەرئەبڕڕێم

باوکە بابە بیٚ خواستی خۆم

هاتوومەتە دنیاکەتان

دنیای سمێڵ و نێرگەلە

ڕێک وەک نەبوو

یان وەک کەسێکی نەهاتوو

بیٚ خواستی خۆم .. باوکە بابە.

لەژووری سکی خاکمەوە لەبار

لەساتی سەر جووقانمەوە

تۆ خەریکی تەدارەکی زیندە بەچاڵکردنمیت و

بەردەوام ئەمسڕیتەوەو

بەردەوام ئەکوژرێم ...

کەچی من هەر لە ( **نەء** ) ێکی جاویدانەدا ڕوواوم



کەچی لەدوای ئەو هەموو جۆرە مردنە

هێشتا ماوم، هێشتا بەپێوە وەستاوم !!

لەژووری سکی دایکمەوە

پەنگریان ڕژاندە ناخم

بۆیە شیعرم ئاگرییە

ئاگریان لەهەناومدا

بۆیە سۆزم زەردەشتییە

بەگەورەیش خاکیان ڕژاندە سەر زامم

بۆیە خوێنەکەم خاکییە !!!

*  *  *  *  *

ئافرەت و کوردستان

ئەم جووتە چەند بەیەک ئەچن !

چەند وەک یەکن

سەیرە .. سەیر





خۆ لەکوردستان بۆ جودا ناکرێتەوە

وای ئەبینم خۆڵو خۆڵین

ژیلەو ژیلەین، ئاوو ئاوین

چەند گرانە

لەپانتایی وێرانیدا لەیەک ئەچین

سووتان .. کۆمان ئەکاتەوە

برین .. کۆمان ئەکاتەوە

رابوون .. کۆمان ئەکاتەوە

زەلیل بوونو چەوسانەوەو

شێت بوون کۆمان ئەکاتەوە.

ئەی هاوارە

لەداستانی کارەساتدا

بۆ هێندە لەیەکتر ئەچین ؟!

لەخاڵی گوماندا

بۆ هێندە جیا ئەبینەوە ؟!

لە (**نەء**) دا، بۆ هێندە یەک ئەگرینەوە



نازانم .. نا

چەند گرانە !

خۆمو کوردستانم بۆ یەک ناخرێتەوە !!!

چەند گرانە

خۆم لەکوردستان بۆ جودا ناکرێتەوە !!!

*     *     *     *     *

پەنجەرەکانی نەوتن ..

پەنجەرەکانی پەنجەرە ...

ئێستا من پرم لەقسە

ئێستا من پرم لەشیعرو

لەخەمو خەم

لێوان لێوم لەئەشکەنجە.

یەک بەیەک ئەتانکەمەوە

پەنجەرەکانی نەوتن

پەنجەرەکانی پەنجەرە.

**1- دزێکی دز**





-گوڵەکان مەحکومن بەوەی

دڕکەکان دراوسێیانبن

چەند دڵم بۆ گوڵ ئەسووتێ ...

-سێبەر بەبێ ئارەزووی خۆی

کراوە بەژنی هەتاو

دڵم بۆ سێبەر ئەسووتێ ...

-سواری دەمو لووت پێچراوی

قەترانیی شەو

ناهێڵێ کچی رووناکی

لەشوێنێکدا ئۆقرە بگرێ

دڵم بۆ تیشک ئەسووتێ ..

گوڵ بوویتایە نەتئەهێڵا

دڕک دراوسێی عومرتبێ

سێبەر بوویتایە تەلاقی



خۆت لەهەتاو وەرئەگرتەو

رووناکی بوویتایە هەرگیز

راتنەئەکرد.

## 2- سیاسەتی کەڵەشێر

لەدەرەوەی مندا بۆخۆی ئەقووقێنێ

کەڵەشێرە ...

حەقیقەت گوێی بەتەنافی

سپێدەی بانگیا هەڵناخات

دەنگی نێرە ...

دەستڕێژێ جنێوی بۆ دێت

ئەقووقێنێ ..

دەستڕێژێکی تری بۆ دێت

ئەقووقێنێو ئەقووقێنێ

چەند بێ ئەقڵە

بۆ ناچێ بۆخۆی بخەوێ؟!

منی مریشک

چەند گاڵتەم بەکەڵەشێر دێ !!!

**3- کاڵبوونەوە**

شێت بوونم کوتو پڕنییە

وردە وردەیە شێت بوونم

سپێدەیەک حەمەدۆکم

وتی (تۆ جوانترین شێتی)

چەپڵەی گەرمی پێکەنینو حوزنم لێدا

ئەو ساتۆکە نامێژوویی‌و زۆر کەمانە

من برسێتی‌و

من تینوێتی‌و

من چەوسانەوەم لێ دەتکا.

خۆڵی بیابانی ساردو

خۆڵی بیابانی گەرم‌و








خۆڵی سیاسەت‌و ولات

نەینووکی جەستەیان تەڵخ کردبووم

دیار نەمابووم لەتەمتومانی شێتییا

نەمتوانی بڵێم جوانی چیم حەمەدۆکم

کاڵبوونەوە کەی جوانییە ؟؟!

**4-دەهری بوون**

ویستم بزانم چەند قەڕنە

لەسەر کورسیی کاسەی سەری

زەمین‌و مێ دانیشتووی

نەمتوانی بزانم

قەبارەی کارەسات، ژمارەی قوربانیی

هەڵوەرینی برژانگی دایکایەتیمان

دەریای خوێن

بڵێی ئەمانە بەس نەبن بۆئەوەی بزانی






تۆ بەتەنیا هیچ ڕەوا نیت

تۆ بەتەنیا هیچ نابەخشی بێجگە لەوێرانی

بێجگەلە مردنێکی نا ئینسانی

لەو مەرگەوە تا ئەم مەرگە

کوانیٚ .. کوا ؟!

چنگی پەریت بۆ زێدی دووگیانم نەهانی

لەو ساتەوە تا ئەم ساتە

چیت پێبووە ؟!

هەموو بوونت ئەتک کردو

هەر وازت نەهانیو

هەر وازت نەهانی .

-یەک بەیەکی پەنجەرەکان پێوە ئەدەن

فێی سیاسەت دەمگرێتو

بەردە فرکێی نێوان ئەو هەموو حزبانە

شوشەکانی ئافرەتیم وردو خاش دەکەن



دواین جاریش ..

دەزانم گیانە دەزانم

من دایکێکی منداڵکارەو

کۆرپەلەیەکی دایکانەم

دواین جاریش ..

نازانم گیانە نازانم

من مەهزلەم یان ئینسانم

دەزانم گیانە دەزانم

نازانم .. گیانە .. نازانم ..!

+ نیوارەیەک

ئەو هات بۆ دیداری یەکیٚ

لەم گۆڕستانە بەرینە ئافرەتییە

کۆتری چاوی ڕەها کردو پێی نەزانی

ئەمە دنیای پاش ڕشتنی کیمیاییە

نەیزانیبوو لەم کیشوەرە

لەخاتوو فروغ بەولاوە ئافرەت نییە!!!

بەرلەوساتە نەیزانیبوو

مێ کامەیەو نێر کامەیە !!!

*          *          *

پەنجەرەکانی نەوتن دەکەمەوە

پەنجەرەکانی پەنجەرە

ئێستا من پڕم لەقسە

ئێستا من پڕم لەشیعرو

لەخەون و خەم

لێوان لێوم لەئەشکەنجە

دەمەوێت نەگریم و ئاژاوەی جیهان و

هێمنیی حەمەدۆک بەئەشکم تەڕنەبن

وەلێ چیبکەم

خەرمانی رۆحمە قرچە قرچ دەسوتێ

فرمێسکەکانم لەماڵی چاوما تەنگەنەفەس دەبن

پەنجەرەکان دەکەنەوەو دێنە دەرێ

خۆزگە دەمتوانی بەقاقای گریان بدوێم







یان بەپرمەی پێکەنین

خۆزگە دەمتوانی بەڕوانین زریکە بتەقێنمەوە

سانایە لام نەغمەیەک لەسەرنج دابنێم

سەمایەک لەوەستان داڕێژم

بەهێما گۆرانی بڵێم ...

وەلێ گرانە لام بدوێم !!!

وشەم نییە سەربە رەگی زمانم بێ

بوونم نییە سەربە تفری ژیانم بێ

سەیرە .. سەیر

من بۆ کوردستانێ دەمرم

عاشقانی ناهێڵن کوردستانم بێ

من خۆشم نەمزانی لەژێر ئاسمانێکی پیاوو

لەسەر زەمینێکی پیاوو لەسایەی خوایەکی پیاودا

ئەم ( نـەء ) ی بالآیەم چۆن رووا

من ئێستاش نازانم باڵی لق و باڵی گەڵاو

باڵی رەگی ئەم درەختە مزمەعیلە بۆ کوێ دەڕوا ؟!





سەیرە .. سەیر

ئا لەم سەردابی عومرەدا

تەنگە نەفەسم بەبۆنی barووتی ئەو هەموو پیاوە

کەچی ئەو درەختی ( نەء ) م لە ( نەء ) دا

بۆ ئاو ئەدات‌و پرچم دەکات بەمەزاری

شیعرو سۆزو تەقینەوە

ئەمە بارانی رابوونەو وەرزی ساڵی ناتەبا بوون

وەرنە بەری‌و پێشوازیکەن

بەکەرنەڤاڵی هەلهەلە ..

کچان‌و ژنانی تەرم وەرنەبەری ..

دوا هەناسەکانی شەرم

بەکەرنەڤاڵی هەلهەلە پێشوازیکەن

ئەمە تیشکەو ئەمە پەرجوو

بۆ ئەم چاخی مێژووی بەردینی ئافرەتە

ئالێرەوە، ئۆقیانووسێک دەبم لەناقایل بوون‌و



زێدێک دەبم لەگلەیی‌و رەتکردنەوە

منم بارانی رابوون‌و وەرزی ساڵی ناتەبا بوون

وەرنەبەر رەحمەتی پرچ‌و سنگی بەفەڕی ئەم هەلە

کۆببنەوەو پێشوازیمکەن بەکەرنەڤاڵی هەلهەلە

ئالێرەوە بچووکتانم، ئالێرەوە پێغەمبەرم

بەڵام نە خواوەند ناردوومی‌و

نە دایکم چاوەڕێی کردووم، نەساحیرێک

نە نیشتمان‌و نە خەڵک !!!

تا زووە بەرد بارانمکەن

باگومان لەپێغەمبەرایەتیم نەکەن

تا باوەڕم پێبهێنن، بەردەبازی هەزار پرسیار

لەسەر رێگامدا بڕوێنن

من خۆم چاوەڕێی باوکم بووم دایکم بێنێت !

خۆم چاوەڕێی خۆم کردووە لەدایکبم !!

من خۆم مامانی خۆم بووم‌و

خۆم ناوکی خۆمم بڕیوە باوەڕ بێنن ...

منم بارانی رابوون‌و وەرزی ساڵی ناتەبا بوون

وەرنە بەر رەحمەتی پرچ‌و سنگی بەفەڕی ئەم هەلە

کۆببنەوەو پێشوازیمکەن بە کەرنەڤاڵی هەلهەلە.

مایس‌و حوزەیرانی 1992 – سلێمانی

*لە ژمارە (2 ) ی نووسەری کورد خولی راپەڕیندا

بلاّوکراوەتەوە.

* دژێکی دژ و سیاسەتی کەڵەشێر لەلایەن ئازاد سوبحی-یەوە

کراون بەعەرەبی‌ولە گۆڤاری

( القافلە)دا بلاّوکراونەتەوە.

* دژێکی دژو سیاسەتی کەڵەشێر جارێک لەلایەن شاعیری

ناسراو فریاد شیرو جارێکی تر لەلایەن کامبیزی کەریمی

شاعیری دیاری رۆژهەلاّتی کوردستانەوە وەرگێڕدراونەتە سەر

زمانی فارسی‌و هەریەکەیان لەکتێبێکدا لە تاران بەچاپ

گەیشتووە.

## شاسواری لوڕستان

* 1 *

چاوێکیانی پێشکوەیەو *

چاوێکیانی پشتکوە ..*

ئاتەشگایەکی زەردەشتی

لەشوێنێکی گیانی ئەودا

لەرزی ناو بەفرم لێدێنیٚو

ئەوی کاسیو*

منی میدی

لەساتێکی ئەبەدیدا

بەجووت دەبینە یەک جەستە.

*2*

ئا ..لوڕستانی کوچکە*

نا ..لوڕستانی بوزورگە*

دەبیٚ بڵێم:







هەر دووکیانە بەیەکەوە

ئەو شاسوارە، بازرە بووە

بالأبەرزە.

*پێشکوەو پشتکوە: دوو ناوچەی لوڕنشینن دەکەونە رۆژئاوای ئێرانەوە، سەرەتای دەرکەوتن‌و نیشتەجیٚ بوونی کوردە فەیلییەکان لەم دوو ناوچەیەدا بووە.

* کاسییەکان: باپیرە گەورەی فەیلییەکانە واتا فەیلییەکان نەوەی کاسییەکانن.

*لوڕکوچکـو لوڕ بوزورگـ:واتا لوڕی بچوکـو گەورە، مەغۆلییەکان کەلوڕستانیان داگیرکرد دابەشیانکرد بۆ ئەو دوو بەشەو وایانناونا.

*3*

بیٚئاگا بووم

لەرۆژئاوای رۆژهەلأتی ماڵی ئێمەوە هەڵیکرد

ئەو پەیامە بەرەنگـ خۆڵیٚو

بەناوەڕۆکـ ئاگرییە.

لەرۆژ ئاوای رۆژهەلاتی رۆحی منەوە وەک کانییەک هەڵقولاَو

بەئاگا بووم

چەند جارێکیش

هەر لەڕەگی، سەرچاوەکەیەوە راونرا

وەک باڵدارێکی سیاهی ئەو دیوو گەردوون

ئەو دیووی بوون

هەرجارەی توشماڵی*

ئاسمانێ تەنگی پێ هەڵچنیو

هەر جارەی توشماڵی زەمینێ دەریکرد.

*4*

منی بچووک،

بەشیعر دەرگاو پەنجەرەی

بچکۆلانەترین دنیام بۆ کردەوەو

لەوێندەرێ،

دەستیم دایە دەستی گەورەترین دیرۆک







گەورەترین .. ئاسەوارو پلەی ئەڤین

* توشماڵ : عومدە، دەرەبەگ، ئاغا بەزمانی فەیلییەکان.

لەناو خۆشەویستیی (ئەو) دا

مردم‌و زیندوو بوومەوە

بەرباد بووم بەعەشقێ

لەشێتەوە گۆڕیمی بۆ شێت بوون.

*5*

چاوێکیانی پێشکوەیەو ..

چاوێکیانی پشتکوەیە ..

قاچێکیانی حکومەتی ئاتابکانی لوڕستانەو*

ئەوی دیکەی جووت دەوڵەتی

ئالخورشیدو ئەتابک*

دەستێکیانی شارەبانەو*

دەستەکەی دیکەیانی شوّش*

منی بەدمەست بەشەرابی ونی ئەو جەستە ونبووەی

لەپێمەوە تا تەوقی سەر

سەرخۆشم .. سەرخۆشم .. سەرخۆش.

*حکومەتی ئاتابکانی لوڕستان: ساڵی (5545) لە لوڕستان

دامەزراوە سێ قەرنی خایاندووە پاشان لەلایەن تەیمور لەنگی

مەغۆڵەوە تێکشکاوە.

*دەوڵەتی ئالخورشید: لە لوڕی بچوک دامەزراوە لەساڵی

(5580) تا ساڵی (5695) ی خایاند.

*دەوڵەتی ئاتابک: لەلوڕی بچووک دامەزراوە لەساڵی (5631)و

تا ساڵی (5693) ی خایاند.

*شارەبان و شۆش:دووشاری بەناوبانگی فەیلییەکانن، شۆش

پایتەختی عیلامییەکان بووە و یەکێ لەشارەسەرەکییەکانی

جیهانبووە.

*6*

ئەرێ شاسواری باڵابەرز؟!

تۆ دڵنیای لەسەردەم و زەمانێکی تردا یەکترمان نەدیووە؟

باش سەیری ئەدگارم بکە








هەست ناکەی لەپەرییەکی چاو پڕکلی

ئێڵی کەلهوڕییان* دەچم؟!

تۆ دڵنیای لەوەی لەتینوێتییەکی سوتێنەردا

کاسە دۆی کەللە تەزێنم بەکۆڵێ شەرمەوە،

نەداویتە دەست

تۆ دڵنیای شەڕە ئاومان نەکردووەو

شەڕە شەقمان نەکردووەو

پێت نەوتووم:

ڕێگام ئەدەیت ماچتبکەم ؟!

بیرت نایەت پێم وتی ( نەو )

ئەو ( نەو )ەم چەند ئازاریدام ..

ئاە .. باڵا جوان

ئێمە کاممان خیانەتمان کرد بەرامبەر ئەوی ترمان ؟!

کاممان پەلەی ژیانمان بوو، زوو هاتینە نێو دنیاوەو

ئەوی دیکەمان بەجێ هێشت !

من ناتوانم گلەیی هیچت لێبکەم

ئەگەر چی کێوی ئەو هەموو ساڵ و

مانگـو رۆژو ساتانەت رژاندە

نێو دەریای نێوان من و خۆت.

*ئێڵی کەلهوڕ: عەشیرەتێکی دێرینی فەیلین.

*7*

ئۆۆ .. غولام رەزاخان*

جەنگی من جیاوازە لەجەنگی قەدەم خێر*

عەشقیشم لەعەشقی جوودایە

من هاتووم

شەڕ بەدنیایەکـ بفرۆشم

چونکە شەڕی بەزۆر هێناوەتە سەر رێم!

من نەهاتووم

تا تۆڵەی نێرێ بسێنم هەر لەبەرئەوەی برامە!!

بەتەنیاش بێ دەبێ هەر جەنگی خۆم بکەم

ئەی کوڕی خودای من، نیشتمان خودامە !!!







1993/7/14 – سلێمانی

- غولام رەزاخان: دواین فەیلییە لەناوچەی پشتکوە وەختی خۆی سوپایەکی دروستکرد لەژێر فەرماندەیی(سەید جەواد فەیلی)و ناردی بۆ هێرشکردنە سەر عوسمانییەکان ئەنجامی شەرەکەش سەرکەوتنی سوپای غولام و تێکشکانی سوپای عوسمانییەکان بوو.
- قەدەم خێر:ژنێکی فەیلی بوو پاش کوژرانی براکەی لەلایەن (رەزا شا)وە پێشەوایەتی شۆڕشی لوڕییەکانی کرد لەناوچەی کوردە فەیلییەکاندا، شەڕی قەدەم خێر سێ ساڵی خایاندو دووجار بەتێکشکان کۆتایی هات ئەم شەڕە لەمێژوودا بەشەڕی (خرماواد) ناسراوە.
- ئەم شیعرە لەژمارە (473) ی کوردستانی نوێ دا بلاوکراوەتەوە.
- وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لەرۆژنامەی الموتمرو گۆڤاری سەرهەڵدان دا بلاوکراوەتەوە.





## دووربینەکانی ئافرەتێ

ئاسمانێکی ئەبەنووسیی،

زەمینێکی ئەبەنووس تر

لەنێوەندی هەردووکیاندا گوزەرێکی سپی سپی

وەک چوڕی شیر

کە باڵندە بەدبەختەکان

ئاهەنگی بووک بردنی پێدادەبەن‌و

ئەشک چاوی تەڕی تیا ژێردەکاتەوە

لە شوێنێکی تابلۆی بوغرەنجی* گەردووندا

کانییەکی پرتەقاڵیی نادیار هەیە، ئەکۆکێ

ئەمە پێشبینییەکی زۆر نەعلەتی‌و پیرۆزە

لە پشکنین‌و گەڕاندا وا گیان لەجەستە دەترازێ

نەبوونی بوون، بوونی نەبوون

پرسیار لەرووی گوڵدا دەتەقێنێتەوەو

مرۆڤ لەعەرش دادەگرێ

تۆپی زەمین کە بەڕەحمی گەردوون دەچێ

پڕە لەبۆشاییو گوناهی شۆخو شەنگ

تا بڵێی خاڵییە لەدەسکی دەرگای رزگاربوون

لەدەسکی پەنجەرەکانی (ئازادیی)

ئەم زەمینە کەنەزۆکترین ئەستێرەو

بەپیتترین ئەستێرەیە

داپۆشراوە بەخۆڵی مەرگ

بە ئەرخەوانو گوڵاڵەی (بەرەڵڵایی)

سەرەتا ناتەباییە ... ناوەڕاست ناتەباییە

وەلێ کۆتایی تەباییو تەباییە.

### 1- دووربینەکانی دووربین

وا بارانی بەرد دەبارێ

چەند دڵم لای رووبارە شوشەییەکانە

زۆر دڵنیام کەسەرجەم هاڕەدەکەنو

لەئاکامدا نەینووکی حەقیقەت دەشکێ !







وا رەشەبای خوێن هەڵدەکات

چەند دڵم لای ئەو چیا لۆکەییانەیە

دەزانم ئاوادەبنو

لەئاکامدا سوور خیانەت لەرەنگەکانی تر دەکاو

دواین جاریش گەل دەیکوژێ !!

چەند دڵم لای ئەمێستایە

چەند لەسبەینێ دەترسم

چەند بەدەست رابردووەوە دەناڵێنم

ئەمێستا ژوارە ..سبەینێ ژوارە .. رابردوو ژوارە

من بەختیاریم بەدزی ئەم سێ ترسەوە پێدەکەمو

وەکو هەورە گرمە دەگریم ...

لەودیوو ئەم سێ جیهانەوە تافی گەنجیم

پیرێژنانە دەنیشێو تەشی کێشەکان دەرێسم

هەندێ جاریش شیرین ئاسا، پل بە تەشیی

عەشقو بیرو مێژووی خاڵییەوە دەدەمو





**لەبەر تاڤگەی گۆرانیمدا وەک ساحیره**

**هەزار وەفایی دەگۆڕم بە ماسیی**

**هەزار شیعر وەک قەوزە دەبن بەبەرگی بەردی دڵمو**

**شۆڕشی ئاو دەکەم بەهەنگامەی شەڕو کەرنەڤاڵی ئاشتیخوازیی**

**دەزانم خەتام کردووه**

**بۆ خۆم خەتام، خەتای گەوره**

**کەڤاڵی سروشتم شێواند بەهاتنی ناوەختم**

**دڵی ئاوم تواندەوه بەئەفسانەو کەیدە گەورەکانی جوانیم**

**سەری بەردو پیره خواکانم داگیرساند بەئاگرم**

**ئاگرم سووتاند بەئاوی گومانچێتیو بێ باوەڕیم !**

**جێگا نییه بۆ مانەوەم**

**لەکاتێکدا هەموو جێگاکان لەبەرم هەڵدەستن**

**هەموو جەستەکان بەر شەڕی بوومەلەرزەی**

**ئازایەتی کون لەجەرگانەبووم کەوتوون**

**بوار نییه بۆ گەورەیم**



**لەکاتێکدا لەمسەری دنیاوه تا ئەو سەری**

**هەر لەشاسوارەوه بیگرن تا ترسنۆک**

**لەونێوەندەیشدا چی هەیە**

**هانایان بۆ هێناومو بەدامێنم فرمێسکی رۆحیان سڕیوەو**

**داوایان لێکردووم، من لەسەر شەهید بوونی خۆم بەردەوامبم**

**ئەوانیش لەسەر وەتیرەی درۆی خۆیان**

**ئەوانی تەرەزان ...**

**دەخوازن لەڕووی ژیاندا**

**من گوناهێکی ڕوو سوورو**

**گەورەیەکی زۆر بچووکـو**

**هەبوویەکی نەبووی دنیاو**

**عەرشی شاهانەی دەرو ناوەوەی خۆمبم**

**دەخوازن لەڕووی مەرگدا**

**ئەوان خۆیانو من خۆمبم.**

**تەنیایی مێینه ...**






بۆ زمانی بەستەزمانی کوردیی هەرگیز

ناگیرێو باسناکرێ

تەنیاییەکی ئەرژەنگە، تەنیاییەکی بکوژە

لەهیچ تەنیاییەک ناچێ

ئێمە کێشەمان هەیە لەگەڵ نووسینو

پیتو فاریزەو ئەفسوونی سەردێڕو کۆتایی دێڕو

خاڵی سەرابیی کۆتایی کۆتایدا.

ئێمە نەئەرزمان دەزانێ بنووسێتو

نەئاسمانمان دەزانێ بخوێنێتەوە،

ئاسمانی ئێمە نەزانانە دەنووسێو

ئەرزمان نەزانانە دەخوێنێتەوە

ڕێکەوتە نەوەی نەزانیی نەزانانو

نەخوێندەواری گشت نەخوێندەوارانین ؟!

نا مەرج نییە ڕێکەوت بێ !

ئەی ئەو نەبێ چی ترە ؟

## 2- دووربینەکانی درۆ یان دووربینەکانی وڵات



لەم بەشە چەپەرەی جیهاندا

لەم خاڵە خەتەرەی ژیاندا

لە شوێنێک کەناو دەبرێ بەکوردستان

دەریا نییە وەک خۆپیشاندانی ئاو

ئۆقیانووسی خوێنو ئێسکو فرمێسک هەیە.

هزر نییە ..

ئەندێشە نییە ..

کات نییە ..

خەون هەیەو خواوەند هەیەو تەمبەڵیش

عەشق هەیەو

درۆ هەیەو

نەگبەتییش ...

ئەم گوڵە میدییە، چقڵێکی میدییە

پێش ئەنفالو دوای ئەنفالیش

پێش ڕشتنی کیمیاییو دوای ڕشتنی

پێشو پاش داگیرکردنی



هەرخۆی بووەو هەر خۆی دەبێ لەچاوماندا

موعجیزە دەبێتو بووە هەروەک فەوتی فەوتاندنی

– ڕاستت دەوێ ئاوا بوو

چارەنووسێکی بێچارە، کردمی بەنووکی خاچی

درۆیەکی گەورەی وەکو خۆشەویستیی ولاّتەوە

چەکوشێکی غەیبیی فێلّباز دایکوتام

دەستی سزای کەیبانوویەکی بلیمەت

لەگەلّ خۆلّدا بێژامییەوەو

لەگەلّ قوڕدا شێلامیو

لەسەر بەردی ڕق کردمیو

لەتەنووری ئاگرێکی خۆشدا دانام

ئابەمجۆرەش منی بێ باوک

لەتابووتی ڕۆژهەلاّتدا بێ باکانە ڕکشامو

لەناو بێشکەی خەونەکانی هوشیاریمدا

منی بێ دایک تێر پێکەنیمو تێر گریام

تێر تێریش گڕو گالّم کرد





بۆ دایەنە میهرەبانەکانی دنیا.

منالّیمە ..

منالّیمە بەمالّە وێرانەکانی ئەمرۆماندا چاو دەگێڕێ

ئاخ منالّی ..

لەتاقیێ ڕادەمێنی وەستان لەڕووی دا

وات لێدەکات ئەقلّت لە لووتتەوە بڕژێ

لەو تاقەدا (مامە ڕیشە) و (تەحسین شاوەیس)*

بەیەکەوە دەبینی

لەو تاقەدا تەواو .. تەواو هیچی کەنا

من دلّنیام لەوە زیاتر ببینی کوێرایت دادێت،

شێت دەبیت ئەی منالّیم.

کوشتمی .. نیشتمان کوشتمی

ڕاستگۆیی کوشتمی

ئاخ دووربینی درۆ بلّێ چەند قەرزی ڕاستیم لەلاتە

بێجگە لەتەمو نەبینین چیت بینیووە

لەدووربینە خوێناوییەکانی ولاّت دا ؟؟





**3- دووربینەکانی عەشق**

لەدوندی هوشیاریمەوە سەیربکەن

تا دواخاڵی پێدەشتەکانی بێ ئەقڵیم

دەبینن پڕم لەتاوان وەک منالْ

پڕیشم لەگوناه وەکو فریشتە

من لەیەک کاتدا خاوەنی سێ دڵدارم

یەک نین، دوو نین، سێ دانەن سێ گرێکانم

نەرسیس*و

تاناتۆس*و

ئیرۆس*

ئەم راستییەم لای شەماڵ وت

لێم بوو بەڕەشەبا

کەلای چیا دووبارەم کردەوە

لێمگۆڕا بەبوولەرە

کەلای رووبار سێبارەم کردەوە

لافاو هەڵسا



کەلای مێژوو چواربارەم کردەوە

زللەی لێدام

کەلای خەڵک پێنج بارەم کردەوە

خاچی ئاگریان بۆدانام

دواجار لەلای خۆم کەشەش بارەم کردەوە

شەماڵ و چیاو رووبارو مێژوو خەڵک سەریانباداو

سلاْواتیاندا لەدیاری فراوانیی دڵی منو

جەبەرووتی پیاوەکانم

یەک نین .. دوو نین .. سێ دانەن سێ کوڕەکانم

نەرسیس بۆ من خۆشەویستێکە بۆ ئەبەد

ناتوانم لەیادی بکەم

*نەرسیس: لەمیسۆلۆژیای یۆنانیدا خودای خۆپەرستییە.

*تاناتۆس: غەریزەی مەرگ و بنەمای واقیعە.

*ئیرۆس: غەریزەی ژیانو بنەمای لەززەتە.





تاناتۆس بۆ من مێردێکە بۆ ئەبەد

ماڵێک کۆمان دەکاتەوە

ئیرۆس بۆ من عەشقێکە بۆ ئەبەد

مانا دەبێ بۆ ژیانم

ئاخ دووربینەکانی عەشق

چەند نزیک دوور دەخەنەوەو

چەند دوور نزیک دەخەنەوە.

دووربینەکانی ئافرەتیم خەریکە وردو خاش دەبن

بیرەوەریم نزیکبینەکان هەڵدەگرێو

شیعری خەلاَلم* لەداری شارستانییەت دەکاتەوە

ئابەمجۆرەش گڵکۆم دەژیو مەرگم دەمرێ.

*   *   *   *

ئاسمانێکی پیرۆزەیی

.. ئەرێیە



زەمینێکی فستقیی

.. نەرێیە

لەنێوەندی هەردووکیاندا هەورە تێکەڵەکانی ڕەنگ

کەبەکاری هونەرمەندێکی شێت دەچن

دڵۆپە بارانی خەونی هەموو دنیا غائیبەو

*خەلاّڵ: خورمای پێنەگەیشتوو پێی دەوترێت خەلاّڵ.

شەستە بارانی خەونی کورد لەوێیە.

ئیدی من تازە نەلەپاڵ ئەرێ دامو

نەلەژێر نەرێ دامو

نەلەبان کلاّوی قوتی ڕنگەکانیش دانیشتووم

من ئەوکاتە لەبەدبەختیم دڵنیا بووم

کەبینیم ئەهریمەنەکانیش بۆمدەگرین




درکەکانیش پەڕۆی سەمایان بۆ بەستووم

دوژمنەکان خۆشیاندەوێم !

کەشەو داهات

چیا دووربینی لووتبەرزیی هەڵدەگرێتو

رووبار دووربینی تەسلیم بوون

من جووتە دووربینی عەشقو ئافرەتی دەکەمە ملمو

شیعریش دووربینی یاخی بوون

ئاسمان دەڵێ:

مەرگی باڵندە مردنی فڕینە.

زەمین دەڵێ:

مەرگی دووربین مردنی ڕوانینە.

منیش دەڵێم:

ئەوەتا ئەنگاوتەی دەستی

خۆشەویستیین نەک حیکمەت

ئەفسانە زاخاومان دەدات نەک حەقیقەت

راستت دەوێ وا هەستدەکەم





بەردەوامیم ئالێرەوە سەرهەڵدەداو

کۆتایشم ئالێرەدا فەوتدەبێ

هەر بەمجۆرەش

گڵکۆم دەژیو مەرگم دەمرێ.

تەمموزو ئابی 1993 سلێمانی

- ئەم قەسیدەیە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبییو لەژمارە (6) ی گۆڤاری (المدى) لە وڵاتی سوریا بلاۆبۆتەوە.





## تەواوی پێناسە ناتەواوەکان

«1»

باران ...

پێکەری چرای بروسکەو

رادیۆی گرمەو

کوژێنەرەوەی دەفتەری وشکاییە

گریانە بۆ ئەو هەموو بەپێوە راوەستانەی دارو

ئەو هەموو دانیشتنەی بەرد

بوژێنەرەوەی دنیایەو بکوژی من

هەر هەموو ئەفسانەکانم کردەبەرمو

باران ئەو ئەفسانەیە بوو

کە نەشیا بۆ لەبەرکردن.

«2»

ئاه ...

چاوەڕوانانی سپاسکار*





دیرۆک هەردەم

بەنێو ئۆقیانووسی خوێن‌و درۆدا سەفەر دەکات

دەربەندی نوێ بدۆزنەوە بۆ ڕەتبوونی

شاپەریکەکانی* مێژوو

شوێنێکی نوێ بخوڵقێنن

بۆ سیزواڵە* تەڕبووەکانی ڕاوەستان

یان بجوڵێن.

*سپاسکار/ بەئەمەک

*شاپەریک/ پەپوولە.

*سیزواڵ/زەڕنەقووتە.

«3»

سەرنج ...

گیر بوون لەچاوەکانی پیاوێکی وەکو (ئەو)

گرانتر بوو لەسەرنجدانی ئێوارە

لە ڕوانین بۆ دەستەکانی خیانەت

لەبینینی مەرگی منداڵ‌و باڵندە،



ون بوونی ناو بازاڕ

پچڕانی پەتی کۆلارە.

«4»

نیتشە ...

وتی: مێینەکان پشیلەن

هەر زۆر گەشەبکەن دەبن بەمانگا

ئەگەر ڕێکەوت بیخستمایە

بێشەلانی تەنیایی ئەو شێتەوە

پێم دەوت تۆیش، تەنانەت تۆیش پێتنەکراوە

بەرامبەرەکەت بناسی

شەوێکم لە عومرت پێبدە

بزانە چۆن لەحەکیمەوە دەتگۆڕم بەنەزان

سەرابەکانی گومانت دەکەم بەمێرگی باوەڕو

مێرگەکانی باوەڕهێنانت دەگۆڕم

بەسەرابی کەسکی گومان.

شەوێکم پێبدە





بەڵام با خۆرێکی بەئاگای تێدابێ

نەک مانگێکی گێلی خەوتوو

تا حەقیقەتت وەکو ماچێ بدەمێو

لە فەیلەسوفەوە بتکەم بە فەلسەفە.

پەراوێز/

نیتشە نەبوو ...

نەخێر خاوەنی ئەڵقەکەی پەنجەم بوو

سپێدەیەک وتی: دەزانی ئافرەتو پشیلە زۆر

بەیەکدەچن؟!

مەبەستم لە جوانییانە!

ئێوارەیەک وتی: ئەگەر زۆر توورە بووی

پەڕۆیەکی سوور دەخەمە بەر هێرشی

توندی نیگاو قۆچەکانت

مەبەستم تەنیا ئەوەیە بتخەمە پێکەنین!

«5»

یش ...



لەبەرئەوەی نە لێپرسراوەو نە ژنی لێپرسراویش

نەسیاسییەو نە ژنی سیاسیش

نە حیزبییەو نە ژنی حیزبیش

بێباکانە دەڕوانێتە ئەو هەورە پڕانەی ئێستا

نا تاوێ تر

تەرزەی راپەڕینێکی نوێ دەڕێژن

هەژار کەی بەدبەختە بۆ خۆی بەدبەختییە

دەبێت بمرێت، لەبەرئەوەی

نە سەرۆکەو نە کوڕ، نە کچ، نە ژنی سەرۆکیش.

«6»

قەیران ...

نووسینەکان چوونە سوڕی متبوونەوە

خامەکان خەوتنو گۆڤارەکان سیس بوونو

رۆژنامەکان هەڵوەرین

ئەمە دەردی کوشندەی بێ ئومێدبوونە

ئەمە باوێشکدانێکی تەمبەڵانەو





دوورو درێژی پاش جەنگە

پاڵکەوتنی بێباکانەی وێران بوونە.

«7»

(* *)

بە خالیدە سەعید* بڵێن: یان بە عەرەب

ئەدۆنیس شیعرە شیعر هەر زۆرم خۆشئەوێ

بە مارسیدس* یان بەهەموو ئەمریکای لاتینی

بڵێن مارکیز، لەپێناوی ئافرەتیما خوڵقاوەو

بە هەناسەی وشەو عەشقی ئەو ئەژیم.

- خالیدە سەعید/ هاوسەری شاعیری بەناوبانگی عەرەب (ئەدۆنیس).
- مارسیدس/ هاوسەری رۆماننوسی بەناوبانگی جیهانی (مارکیز).

پەراوێز/



لەهاوینی ساڵی 1980 دا (ئەم) پرسیبووی: گارسیا مارکیز

مرۆڤێکی چۆنە؟ (ئەو) یش لەوەڵامدا سەری لەقاندبوو: گارسیا؟

تەنیا لۆتییەکی بەرەڵلایەو هیچی تر نا!

ئەم ددانەکانی جووت کردبوو ئینجا وتبووی: بەختەوەرە ئەو

میللەتەی لۆتیو بەرەڵلاکانی گارسیا ماکیزبن!

ئەم: عەلی ساڵحیی شاعیرو رۆماننوسو رەخنەگرو سیناریۆ

نووسی ئێرانی بوو.

ئەویش: سەفیری باڵیۆزخانەی (کۆڵۆمبیا) لەتاران.

«8»

شین ...

رەنگ نییە !

پیتیش نییە!

ئەوەیش نییە کە بۆ مردوو سازدەکرێ !

ئاخ لە شینو داخ لە شین

هەر بۆ خۆم ئەزانم چییە !!!

«9»





بەرد ...

لە بەرد هەڵنووتی

بوو بەخۆڵ

جەستە لە جەستە هەڵنووتی

دنیا پڕبوو لەبارانی ئیرۆس و منالّو پێکەنین

شەڕ لەخێر هەڵنووتی

جەنگێکی ئەبەدی کەوتەوە

خیر لە خێر هەڵنووتی

بوومەلەرزەیەک جیهانی لەبێژنگداو

پاشماوەکانی جەنگیشی خاپوورکرد .

«10»

فایەق بێکەس...

ئیدی ئەو سروودانەیە کە قوتابخانەکان هەردەم

بەیانیان بەرلە وانەی یەکەم دەیڵێنەوە

خەمی ئەبەدیی نەسرینەکانی کوردستانەو

نیشتمان و مەی هەتیون لەدوای ئەو .



«11»

لەمافی مرۆڤەوە ...

چۆن رێز لە چۆلەکە بگرم

کە ئەو مافی خەوی خۆشی بەیانیانی خەوتووان

دەخاتە ژێر پێیەکانیو

لە دەغڵی جووتیارەکانا خەریکی دزییە !

«12»

لەمنەوە ...

رقم لە توندو تیژییە ..

رقم لە توندو تیژییە ..

رقم لە توندو تیژییە ..

1993/12/1- سلێمانی

*کراوە بەعەرەبیو لە رۆژنامەی (الاتحاد)دا بلاّوبۆتەوە.







لەو کۆلاٌنە

عەتری یادەوەریی هەیە

بەلاٌم (بۆن) کۆناکرێتەوە

دەنا شووشە بەتاڵەکانی عاتیفەم لێوان دەکرد.

ماڵی هەموو برادەرە کۆنەکانم لەوێ بوون

ماڵی برادەرە شەهیدو برادەرە خیانەتکارەکانم

ماڵی ئەوانەیش کەتەنیا جارێ منو

سەد جار ولاٌتیان جێ هێشتو

وەک ناوی مردووان لەیادیان کردین.

لەو کۆلاٌنە

مناڵێتی هەردەم گەورەنەبووی ئێمە

بۆ ئەبەد مناڵە

پاکیزەیی وەک کۆلارە هەڵئەداتو

بەختیاری وەک بنێشت دەجووێت



خەونی ئێمە لەو دەڤەرەدا هەمیشە ساکارە

تەکنەلۆژیاو سایکۆلۆژیاو سۆسۆلۆژیاو

هیچ لۆژیایەکی پێناوێت.

جاران لەوێ هاوڕێ کچەکانم ماچیان دەبەشییەوەو

منیش ...هیچ

بۆیە ئەوان بەتێکڕای دەنگ

باوەڕیان بەشاعیرێتیم نەبوو

نا ... بەهەڵەدا نەچوو بوون راستیان ئەکرد

ئەو رۆژانە لەژێرەوە سنگم بەپەڕۆ دەبەستو

قژم لەژێر کاسکێتێکی خاکیدا دەشاردەوە

ئەو وەرزانە لەماڵی ئێمە ژنێتی عەیب بوو

ئەمن شەرواڵو مراخانیم دەپۆشیو

کە لەم دێ دەچووین بۆ ئەو دێ

سوار بوونی ولاٌخم رەتئەکردەوە !

نیوەی رۆژەکانی ئەوسام

لەودیوو دەرگاوە بردۆتە سەرو





هەردەم تەریق بوومەتەوە

بۆ خۆشم نازانم لەچی !

هەمیشە شەرمم کردووە

تێناگەم، نازانم بۆچی !

لەو کۆڵانە

ئای .. دەروێشی (کۆمەڵە) بووم

وای عاشقی کۆمەڵە بووم

وەلێ ئەو خەونە دڵڕەقە

بێئاگابوو لەخەونی تاک

ئێمەش لەکۆبوونەوەکاندا

باسی هەموو شتمان ئەکرد

بەربادبوونی خۆمان نەبێ !

چەند سەیربوو .. لەوکۆڵانە

شێتانە یاریمان ئەکرد

کەچی ئەوەی یاریی نەئەکرد کۆتایی ئەیبردەوە !

لەوێندەرێ، مناڵیم یارێکی بچکۆلانەی هەبوو



ناویان لێنابوو فریشتە

کەچی لەسەر پیاوکوژیی کوشتیانەوە !

تۆئەزانی لەپێناسەکەم نووسراوە

کەژاڵ ئەحمەد سەعید

67/7/30 ، شاری کەرکوک

ئەو ناوە، ئەو کاتە، ئەو شوێنە

هیچیان ناوو کاتو شوێنی ئێستام نین

ئەمەیان پێناسەکەمە:

کەژاڵ ئەحمەد "لەبەر شیعر"

67/7/14 "چونکە 30 هەڵەی باوکمە"

سلێمانی "نازانم بۆچی کەرکوک نا .."

تۆ دەزانی ئەمن لەدوای شیعرەکانی

گەورەترین، بەناوبانگترین شاعیری کوردو

سەرکەوتنە سوورەکانی

مەزنترین، ئازاترین جەنگاوەری کوردەوەبووم؟

هەر منیش هۆی بەدناوبوونو ئابڕووچوونی





سکرتێری نوێترین حیزبۆکە بووم

بەڵام بێبەریم لەمەرگـو شێتبوونی

ئەو ژنانەی کەئیرەیم پێئەبەن،

ئەو پیاوانەی بەناهەق دەیانخەنە دووم

زۆر بێبەریم لەو ئاتەشە بوزورگانەی

بەبیٚ مەبەست ئەرۆمو ئەیانکەمەوە

لەئەفسوونی ئەو جوانییە بکوژانەم کەدلاٌن حەیران دەکاتـو

ئەبێتە فیتنەی دەولەتان

گوناهی من نییە، چاوم ئەو کارەساتـو شەڕانە ئەنێتەوە

تاوانی من نییە شیعر، خۆری باٌلم پیٚ ئەبەخشیٚو

ئیدی ئەفرم

مانگی وشەم پێشکەش ئەکاو

ئیدی نامرم

لەوکۆلاٌنە عەتری بیرەوەریی هەبوو

فەزا هەبوو بۆ تێپەڕین

ناکۆتا هەبوو بۆ ڕوانین



بەلاٌم ئێستا

با هەمیشە بیٚ پەیمانە وەکو پیاوان

ئاو هەمیشە حول حولییە وەکو ژنان

خۆلٌ هەردەم خیانەتکارە وەکو پیاوان

ئاگر هەردەم درۆزنە وەکو ژنان

بەیانیان هەورەبانەکە گسک ئەیەم

جلی کەوتووی تەنافە پچڕاوەکان کۆئەکەمەوە

قاپ ئەشۆمو مالٌ ئەشۆمو خۆم ئەشۆم

خەوی مالٌ لەخشـو هوڕی

کراسە پەمبە ئاودامانییەکەم ڕائەبیٚ

نانی بەیانی ئەخواتـو دووبارە ئەخەوێتەوە

منیش لەنێو جۆلانەدا ئەم قەسیدەیە ئەنووسم:

بێدەنگی وام بۆ دووبارە نابێتەوە

لەوکۆلاٌنە شیعر هەبوو ..بۆی بژین

عەشق هەبوو .. بۆی بمرین

جۆگەلەی خوێن تەنکتربوو





لەپاڵیدا براکان شەڕیان ئەکرد .. ئاشتئەبوونەوە

کەچی خراپە هەرگیز وا بەرین‌و ترسناک نەبوو

تۆ ئەڵێی چەند ساڵم ئەوێ

تا ئەوانە ئاشتکەمەوە کە دوێنێ زوویرمکردوون ؟

تا ئەو ملە بایکانە لەیادبکەم کەبەملی

خوشکە بچکۆلەکەم دەچن؟

ئەم ناخودایە سەرخۆشە

بۆیە دنیا

ساتێ ئارامیی نابینێ

شەهرەیاری خۆشەویستی من عەدەمە

ئەزانێ سەراپای عومرم خۆکوشتنە

کەچی بەر لەگوێ ڕادێران

خۆم‌و حیکایەتم ئەکوژێ .

سلێمانی - 1994



## مێردمەو مێردیشم نییە !

مێژوو .. ئەو یارە گەوجەی من

حەتحەتۆکەی دووبارە لەدایک بوون‌و

حاجیلەی نەمریی لەدەستداو تێپەڕی

ئەو کورسییانەی لەتەم بوون

ئەو تاجانەی لەدووکەڵ بوون

ئەو زێدانەی لەسەراب

هێندەی جەستە

جوانە، نوێیە، گەرمەکەی من ڕاستگۆ نەبوون

ڕاستگۆ نابن وەک درۆی ئایەتی ئافات.





مێژوو .. ئەو مێردە پیرەی من

ئەوەی نەشەرع، نەیاسا، نەخەڵک

نەیانکردە مێردم

ئەو خۆیشی نەهاتە داوام

ڕەدووی خستم، بۆئەوەی بەجێمبهێڵێت !!

تا لەخوا تەنیاتربم و لەئافرەتیش بێ پەناتر

دڵ باتمیشی

ئەوینی ئاویی پیاوێکی ئاگریی ئاگر پەرستو

دوورگەیەکی تاسەر ئێسک نێرینەی مێ نەویستە

ئەو مێژووە ...

بۆ خۆی چاکترین خراپی دونیاکەمەو

من نەبووم لەدونیاکەیدا.

* * * *

خەیلێ درەنگ تێگەیشتم

ئەی ئەو عەشقەم



کەگۆشکراوی بەژەهرو ژەکی گوناه

بێ من نەژیاویتو نەژیابوویتو ناژیت

وەلێ بەبێ من ڕۆشتبوویتو ڕۆشتیتو ئەڕۆیت

خاکی نوێو دایکی نوێ ئەدۆزیتەوە

سروشت گەورەیت بەشئەدات

ئەبیتە عاشقی خۆتو بەردو شیعر

لەسادەییو چڕیم دوور ئەکەویتەوە

شاسوارە ترسنۆکەکە ...

ئەی ئاشتیخوازترین سوارو شەڕەنگێزترینیان

تۆ ماڵێکی کۆنکرێتیی، پەنجەرە شکاوی دەرگا

گوڵ لێتکاو شک ئەبەیتو

بەردەوام لەسەر بەرماڵی ئەو ماڵە کاغەزینەی خۆت

ئێوارە ڕۆحم ئەکێشیو سپێدە ڕۆح ئەکەیتەوە بەبەرمدا

ئۆف خوایە گیان ...

وا خەمی شتێ دایگرتووم

ناوێرم بزانم چییە

شتێ ڕۆحم ئەکات بەپەڵەیەک خوێنو

جەستەشم ئەکات بەپەڕۆ.

مێردمیتو

بەمانەوەم وەکو کچ گومانم خوڵقاندووە لەپیاوەتیت

ئەمەیان بەهێزیی منەو بێ هێزیی تۆ

مێردمنیتو کەژنی خودی تۆم

بووم بە هێمای نەبوونی بوون !

ئەمەشیان تیژ بینی چاوی ئەقڵی منەو

کول بینی چاوی ئەقڵی تۆ

مێردمیتو مێردیشم نیت

کەئەز بەختم لەڕەنگی چاوو کەزیمە








(چەمۆڵە بۆ من، ئاوێنە بۆ تۆ)* !

*ئەمە پێچەوانە کردنەوەی ئەو گۆرانییەی منداڵییە کە ئەڵێت:

چەمۆڵە بۆ تۆ ئاوێنە بۆ من.

1994 – هەولێر





## ئەوێندەر

لەوێندەر لەدایک بووم‌و

لەوێندەر دەژیم‌و

ئەوێندەرم نەبینیووە !

خۆم لێرەم‌و

ڕەگێکی سەرکێشم لەوێیە

بریتییە لەڕەگی خەون، عەشق، شێتبوون

کەی دەمبەیت بۆ ئەوێندەر ئەی ڕەگی من ؟!

کەی دەمبەیتەوە بۆ لای خۆم،

بۆلای چرکەی یەکەمی بوون ؟!

کەی دەمبەیت ، کەی ؟!

بۆ نزیکترین ماڵۆچکە

لەسەرجەمی هەموو گوناهەکانتەوە

بۆ دوورترین کوڵان‌و ڕێگاو دەروازە



لەسێبەری ماڵی منالەکانتەوە

ئەو منالانەی هی تۆن‌و هی من نین !

تۆکەی دەمبەیت بۆ ڕاکردن

بۆ ڕزگاربوون

بەپەلکەزێڕینەی باڵت هەڵمبگرە

هەڵۆی پەرجوو

بێ پەروا زامدار کراوم

بێ پەروا ژوارم دیووە بووم بەمردن

بمبە بۆ ماڵی ئاگرو ماڵی بەفر

پاش هەڵقرچان‌و هەڵلەرزین

یەک بەیەکی گومانەکانم ببەخشە

بەتابووتی فەنا بوون .





من لەتۆ زیاترم ناویٚ

تۆ زۆری زۆر

ئیدی گلەیشم نەما لەژیانو

ژەهری مەودا سیاهەکان .

ئەریٚ باشە من چۆن توانیم

تا ئەم ڕادەیە شەیدابم ؟

تۆ لەناو جیٚگای شەومدا نەتگرتوومو

لەئیٚوارەیەکی تابڵیٚی ناوەخـتـو

سپیٚدەیەکی زۆر زوودا نەتبینیووم

ساتەکانی توانەوەی تەواوەتیم

ئەی خۆر لە تۆ خاڵی بوون

ئۆی چۆن توانیم سەراپای ڕۆژ

ئابەوجۆرە دڵ ئاسنو ناسکبم ؟!

ئای بیرت لیٚ ئەکەمەوە



لەسنووری کاتەکانو

لەودیوو تخوبی کاتەکانیشدا

من بەتەنیا لەشیعر هیٚندە ڕاماوم

خەم بەو توندییە ڕایگرتووم

بەبیرم بیٚ

کەس وا داگیری نەکردووم.

سلیٚمانی – 1994

* کراوە بە عەرەبیو لە ڕۆژنامە (الاتحاد) دا بلاْوکراوەتەوە





## نوونەکانی نەرێ

### یەکەم/

### نەبوون

ئاه ..خۆزگە بوون گوێزێ بووایە

توێکڵەکەیم زۆر دڵڕەقانە ئەشکاندو

کاکڵەکەیم زۆر بەلەززەتەوە ئەخوارد.

باشە چی ئەکەیت لەبوونێ

شەنگترین گوڵی لێکراوەی گەردوونە ؟!

بەدیارییەوە دائەنیشی ؟

تا گەشە بیر لەسیس بوونیو

کەسیس بوو بیر لەمردنیو

کە مردیش بیر لەتەواو بوونی عومرو

تەواو بوونی بیرکردنەوە ئەکەیتەوە ؟!

ئاه .. خۆزگە بوون چرا بووایە





بەفوویەک ئەمکوژاندەوە

خۆزگە نەبوون مردن بووایە

هەنووکە ئەمردم.

وا پێ ئەچێ هەڵکردن لەگەڵ مەرگدا

ساناتر بێ لەهاوڕێیەتی کردنی ژین

کەس مردن بەجێ ناهێڵێ

بەڵام ژیان هەمیشە بەجێ هێڵراوە

ئاه .. خۆزگە بوون نەبوون بوایە

خۆزگە نەبوونیش بوون بووایە !



دووەم/

## خۆشنەویستن

هەور ئاسمانی خۆشناوێ

چونکە ئەتوانێ بباریێتە سەر زەمین

باران زەمینی خۆشناوێ

چونکە ئەتوانێ ببێت بەهەڵم

بڕوات .. بفڕێ

خۆریش مرۆڤی خۆشناوێ

هەموو شەوێ دڵی دێ بەجێی بهێڵێت

مانگ مرۆڤی خۆشناوێ

هەموو ڕۆژێ دڵی دێ غائیب بێ

خواش مرۆڤی خۆشناوێ

چونکە توانی لەبەهەشتی وەدەرنێ





تۆش منت خۆشناوێ

چونکە ئەتوانی بەبێ من بژیت

سەفەر بکەیت، بیرت بچێ ...

کارەساتیش لەوەدایە مرۆڤ مرۆڤی خۆشناوێ !

دەنا چۆن چۆنی ئەیتوانی

بمرێ ..بکوژێ ، بخەوێت یان زوویر ببێ !

**سێیەم/**

**نەشاز**

دەنگی دیکتاتۆرەکانو تیلەی چاوی دزەکان

جەنگی سیاسییەکانو سیمای خۆفرۆشان

نەشازی دنیاکەمانن ..



کەی تەواو بوون

ئەوکاتە سیمفۆنیای ژیان دەست پێئەکات.

**چوارەم/**

**نەتوانین**

پێی وتم: شەهرەزاد ...

گەمەی حیکایەت ڕگرە

ناتوانم نەتکوژم !

**پێنجەم/**

**نارەسەن**

هەموویان ماڵیان بەجێ هێشت

خەنی لەخۆمان جاروباری دێنەوە

نیشتمانیان لەپێ کردو

لەدوور ڕا ئەیلاوێننەوە

ئێستایش خۆیان بەکوڕی ماڵێ ئەزانن

کەپوو ئەکەنە ئاسمانو ڕەخنە ئەگرن

نازانن خۆڵ لەکتێبی مێژووی خۆیدا

**بەندەری بەرمۆدا**

دایکم لەوێ دوعا ئەکات، بۆ ئەوانەی بەمردن ...

بەسەفەر ...

سەفەری دوور یان نزیک ڕۆیشتوون

منیش لێرە جلو یادی بەجێماویان قەدئەکەم

ئەم دایکەم

گەلێ جار زۆرم لێئەکات نامەی عەتراوی بنووسم

بۆ دوورە ولاٌتان و زیندانییەکان و تەنانەت شەهیدەکانیش !

هەموو سپێدەیەک ئەڵێ: هەستئەکەم ئەگەڕێنەوە !

بەلاٌم هەرگیز من چاوەڕوانی ڕوودانی باشەیەک نیم

ئیدی دەستیشم لەدنیا شۆردو چاوەڕوانی هیچیش نابم

ئێ پاش ئەوەی هەموویم تەلاٌقداو

ئۆقیانووسەکانی ئەشکم بوون بەقاقڕ

چی بڵێم پێکەنین نەبێ ؟

ئەدی تۆ ئەخوازی چۆنبم ؟



من گیرۆدەی جوانیی خۆمم

تۆ نازانی جوانیی چەندە بەدەختییە،

زێدێکە خوڵقاوە بۆ داگیرکردن

بەتالاٌن بردن، خاپوور بوون

هەروەها ...

کوژراوی ئەو خەونەم کە لەوێنەی نییە

کوژراوی تۆم، تۆ ... لەگەڵ تۆمە ئەی شیعر

شۆخترین بەرمۆدا.

- ماسی گەورە ماسی بچووک قووت ئەدات

ژنیش دەریا، ژیانیش مرۆڤەکان

بەرمۆدا ژیان قووت ئەدات

دڵیشم ماسی و مرۆڤو بەرمۆداو تاوانەکان.

- گەردنی کەشتییەکەت ئازادکە ناخودا

تا ون نەبیت لەسیحری ون بوون تێناگەیت.

- ئەو ڕێکەوتانەی لەناکاوێک دێنە ڕێت

جوانترن لەوانەی لەناکاو، ئەیانخەیتە ڕێگای یەکێ





تەنانەت نەمرتریشن.

- چەند خۆشە تەسلیم بوون .. پاش تەمەنێک لەیاخی بوون

چەند بەتامە ئاشتبوونەوە .. پاش زەمانێک لەشەڕو شۆڕ

دوای قەرنێک لەجیابوونەوە.

چۆن خەتەرێکە نزیکی ... چ ئەفسوونێکە دوای دووری

بەو ڕادەیە، بەو جۆرە ئاوێزان.

- ئەرێ هەنگوین کەی ئەگاتە ئەو قسانەی

خۆت بۆ ئامادەنەکردوون و ئەیانڵێیت ؟!

چی بەو هەواڵانە ئەگات

کە ڕەگت دائەچڵەکێنن بەر لەگەڵات ؟!

- هیچ شتێ

نابێت بەمانایەک بۆ هەبوون

ئەوە نەبێ کەلەناکاو بە ڕووتدا ئەتەقێتەوەو

پارچەکانی ڕەنگت بەئاسماندا ئەبات.

ئاخ ئەی یار ...خۆشم ئەوێی



بەخودا

بەقورئان

بەسەری خۆت

نەخێر باوەڕم پێمەکە !

لەبەرئەوەی دوا کچو دوا وەچەو میراتگری بەرمۆدام

تاکە جودایی نێوانی منو باپیرەشم هەر ئەوەیە

ئەو پیاوێکی سێ گۆشەبوو

من کچێکی بێ گۆشەم !

گۆشە چییە ؟!

بەیەکگەشتن، یەکتربڕینی

دوو هێڵی عاشق نەبێ لەخاڵێکدا

ئەگەر وابێ

چەند بازنەیەکی داخراوو

چەند هێڵێکی ناکۆتام

بەگومانبە لە وەجدی ڕستگۆیم

ئەمە دنیای خیانەتە






هەر زۆرم خۆشئەوێی

هەرگیز باوەڕم پێمەکە

گوڵ لەکوێیە کەپەپوولە ئەچێتە ژووانی چرا ؟!

ئەی کوردایەتی لەکوێیە کەسیاسی

حزبەکەی خۆی ئەهێنێتو

میللەتەکەی تەڵاق ئەدا ؟

تۆ ئەی یار لەکوێ بووی کەشیعر تەفرەیدام ؟!

کە سەد خەنجەرم بەرکەوتو

سەد تانەم گرتەوە

کە سەد ڕمو سەد تیرو دووسەد گوللەیان پێوەنام ؟!

پێم وتیت:

هەموو بوون بەرمۆدا بووە

بەرمۆدا ئەبێتو بەرمۆدایە .. بەرمۆدا

پاش ئەمەش ئەخوازی چی بڵێم

گریانی بێدەنگیی نەبێت ؟!

دوورە دەست ترین ئاشناو



دوایەمین یار ...

مەترسی، غەیب، نادیار حیکمەتەکانی ئەم مەملەکەتەن

نەزانین، ئەندێشە، ئەفسوون فریاد ڕەسن، سەبوورین

(ئەو) حەقیقەتی پێوتینو ڕاستی کرد

چەند نەوەیەکی بەدبەختو سەرسەخت بووین

نەوەی ساڵەکانی شەستو ناوەڕاستی شەستەکان

هەموو جەنگەکان ڕژانە نێو جۆگەلە، کەم خوێنەکانی

تەمەنی

زەرد هەڵگەڕاوی ئێمەوە

هەموو مینو قینەکانی، خراپەکاریو غەمباریی

بە ئێمەدا تەقینەوە !

خۆزگەمان بەوانەی ، کە لەئێمە گەورەترن

خۆزگەمان بەوانەی، کە لەئێمە مناڵترن

سەد خۆزگەمان بەوانەی لەدایک نەبوون

تۆ بڕوانە کارەساتی ئەو هەموو سەربازو

کوڕ کوژراوو بێوەژنە

## تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

چارەنووسمان وەک چارەنووسی کچێکی بێ بن بوو !

- کتێبەکان فتیلی فیتنەیان پێکرد

باوەڕەکان ئەو هەموو گوڵە گەنجەیان بەکوشتدا

ئینجا کتێبو باوەڕە حول حولییەکان چییان نەکرد ؟!

( لەرووناکبیریێ بپرسە ئەو وەڵامت ئەداتەوە )

- فێرم بکە، چۆن بتوانم

(کەم بژیمو کەڵێ بژیم)

ئەو منداڵەی کەهێشتا نەمبووە

ئەم پرسیارەی لەگڵکۆی سەرکردەیەک کرد

ئەو منداڵەی کە هێشتا نەمبووەو

ناشمبێت !

- ئەم وڵاتە وڵاتی هەموو کەسێکە

خاوەنە راستەقینەکانی خۆی نەبن

باشە بۆچی تەمەنمان بەسەراب بەخشی ؟!

(تۆ بڵێی چ نائومێدێ خاوەنی ئەم وتەیە بێت ؟)

پرسیار چییە؟؟








بەیانکردنی نەزانینێکی بێدار نەبێ بەزانین

وەڵام چییە؟؟؟

زانینێنەبێ کە نەزانین ئەهێنێو ئەیکاتەوە بەپرسیار

ئازیزترینو دوورە دەست ترین یار

ئەرێ نامە نەخشینەکانی پەپوولەت لەیادە ؟!

کە پەیڤەکانی بەفرین ئەچوون

بۆنخۆشیو گەرمیشیان بەخۆت.

چاوە ئەبەنووسییەکانم

لەنێو یەکێ لەو نامە دڵتەنگانەدان

تکایە مەیاننێرەوە

بهێڵە با بەرمۆدابم

ڕێمپێبدە ببم بەکوێرێکی بەختیار.

سەرەتاو کۆتایی 1994 -

هەولێر





## بازنەی باران

بۆخاتری باران بوو
ئەو هەموو پەیڤین‌و پێکەوە بوونە
لەچاوی ئەوی ئەناسم
پیاسە بێ ڕووگەکانی ئێواران‌و
ئەو ماچانەی بۆ کاتێکی دیاری نەکراو
دواخران.
بارانەکە .. مۆڵەتی لەکەس وەرنەگرت
لەبەرئەوەی بەتاقی ئاسمانەوە زۆر تەنیابوو
لەپڕ هات، سەراپای دنیای مەستکردو
شەڕی عەشقی بەعەرد فرۆشت
عەردیش ناچار لێی کڕیی .
بارانەکە .. فرە لەئێمە نیشتمان پەروەر تربوو
ئەو ئاقاری نادیاری شەنگترین ئەقڵی نیشاندایین
ئەقڵێکی نا ئاقلانە، ئەقڵێکی شێت



بەڵام ئێمە هەموو شت بووین، هیچیش نەبووین
بۆیە بەقسەی ئەومان نەکرد.
(ئەو) دایکردو هیچ وەستانەوەی بۆ نەبوو
وەک نەزیفی دەردی فیراق
بە وێنەی ئیشتییاق
خاکی وەک نانێکی تیری تەڕکردو
شەرگەگانیشی لەگوناه پاککردەوە.
ئەبووایە بێی، ئەی چۆن خۆی باران بەمانای نزیکی
ئەبووایە غائیب بی، بۆئەوەی بمرم‌و تێبگەی
تا چ پلەیەکی بکوژ
تا چ ڕادەیەک لەوەجد خۆشمئەوێیت.
پیاوەکە ...
وەرزی پاڵتۆ لەبەر کردن
چەترو جانتا هەڵگرتن بەسەر چوو
چاو لەم گەنجێتییەی من‌و
ئەو ڕووتییەی ڕووبار بکە.

ڕقم لەو شتەیە کەداگیرت ئەکات

نەک هەر پاڵتۆ

هەندێجار ڕقم لەخۆشمە !

بەداخەوە

بۆخاتری تەڕنەبوون لای مرۆڤ

دڵشکاندنی هەورەکان چەند سانایە ؟

لەپێناوی مانەوەیەکدا بەپیسی

هەڵدانی چەتری ڕەنگاڵەی درۆ کردن ڕەوایە.

نەخێر، نەمویستو ناشمەوێ

سەربە تفری ڕەگەزێیم

کەسەربەرزانە لەشەڕانگێزیی ئەدوێو

شەرمەزارانە لەعەشق.

نەرسیسی خۆشەویست

لەپێناوی تۆدا بوو نەک باران

ئەم وێرانە بوێرانە کەوێرانی وێرانکاران وێرانیانکرد!

بۆخاتری باران بوو نەک تۆ کەپرسیم







چی ئەبوو ئەگەر ڕەشەبا

مەرحەبای لەگەڵ هێمنی هەبووایە ؟

ئەی نەئەکرا شەماڵ تووڕەبوون بزانێو

پەپوولە فێربێ بەرگریی لەبوونی بکاو

منیش ئیدی ئاقڵبم.

بارانەکە ...

تۆ ئەڵێی کورد چییە ؟

عەبەسە ؟

پەرجووە ؟

یان هیچکامیان ؟

دڵنیام بێجگە لەئازا شتێکی تریشە بەڵام

بۆمنییە بیزانم !

ئایا تەنیا هەر بارانو برادەرانم ئەزانن

ئەوێندەری من کوێندەرە

وا تۆ ئەڵێی زێدی شیعرەو

گوڵ ئەڵێ هەر هەموو شوێنو ناشوێنەکانی دنیایەو





دڕک ئەڵێ هەندەرانە ؟!

ئاه ... پیاوەکە

ئێ خۆ شیعر مەتەڵ نییە هەڵی بێنی

ئەو ئەوێندەرەم کەرکوکە.

شەوەهای شەو

لەبەرگەوە بۆ بەرگ مێژووم خوێندەوە

بەتەنیا کوژراوی باڵای شەرەفخان بووم

لەنووکەوە بۆ نووک حیکایەتەکانی

شۆڕشم بیستو بەردەوام سەرگەردان بووم

تۆ لەکوێوە هەڵقولاێتو

بوویت بەسەرداری ئەم کەونە

چۆن بووی بەوەی بۆتبگریم

پیاوەکە ...

بۆخاتری باران بوو

ئەو هەموو پەیقینو پێکەوە بوونە

لەچاوی ئەوی ئەناسم



پیاسە بێ ڕووگەکانی ئێوارانو

ئەو باسانەی بۆ کاتێکی دیاریی نەکراو

دواخران ...

1995 - هەولێر






## بازنەکانی گوڵ

من نەبووم نا ...

کەسێک بوو، شتێک بوو لەمندا ئەوەی کرد

پۆزش بۆ خوا ئەهێنمەوە

بۆ فریشتەو ئەهریمەنە جوانکیلەکان.

پۆزش بۆ خۆر ئەهێنمەوە

بۆ مانگ و ئەستێرە دوورە زۆر زۆر دوورەکانی فەلەک

من بووم و منیش نەبووم کە

ئەو شەڕو شۆڕو شۆڕش و

شێتییە شەپرێوانەم کرد

ئاخ ئەی (من) ...

ئەی منی خراپ

تۆ چیتداوە لەتاوانەکانی وتن

لەگوناهی ناگەهانی خۆشویستن

لە هاواری بەرلە هەڵوەرینی گوڵێک



ئەو هەموو دوژمنەت بۆ هەبن ؟!

ئاخ ئەی (من) ...

ئەی منی باش

تۆش ئەکرا لەژێر سێبەری

دار گوێزەکانی درۆدا ڕاکشێیت و

گوێ لەقاسپەی کەوە خۆ خۆرەکان بگری

کە زەمەنیش وتی سڵاو

وەڵامێکی سارد و سرِی بدەیتەوە

کە زەمین وتی ماڵئاوا

بە باوێشکێکی خەواڵوو بەرێی بکەی

ئەم بەئاگابوونە بۆچی ئەی بێ ئاگا

ماڵی ئەقڵ پێویستی بەنووستنە !

بەڕاست من گۆڕێکم هەیە لە تاران

فروغی تێدا دەژی !

ماڵێکم هەیە لەئێران

گوگوش گوڵی تیا ئەفرۆشێ

یارێکم هەیە لەوێندەر، ئەمیریکی ساسانییە

حافیزو شامیلۆو نیما لەئەو بوون.

ئاه ... خۆزگە ئاو فرۆشەکان

گوڵفرۆش بوونایە

بۆئەوەی بتوانم بژیم.

ئاه ...خۆزگە دڵفرۆشەکان

شەرفرۆش بوونایە

بۆئەوەی چی دی باوەڕیان پێنەکەم.

بەڕاست من ماڵێکم هەیە لەنێو مانگ

گۆڕێکم هەیە لەسەر ڕێی کاکێشان

دارێکم هەیە لەوێندەر

هێند دوورە دارا نایبینێ

ئازار لە نینۆکی دەتکێتو ڕەگەکانی نەوتاوین

شێرێکم هەیە بەسەر پشتی خۆی ئەمبات

بۆ نێو کۆشکی میرەکانو ئەفسانەکانی ئەوێندەر

شێرەکەم ئاڵتوونە، ئاڵتوون.



لەهەر شوێنێ برادەرێ، مرۆڤێکی باش هەبێ

من ماڵێکو گۆڕێکیشم هەیە لەوێ

بەلام جوانترین ماڵی منو گۆڕی من

تەنیاییەکی ئەبەدیو

چاڵی چەناگەی وەهمێکە

بەگوڵی حەقیقەت ئەچێ

ئاخ ... ئەی (من) ...

ئەی منی نەرم

بۆ سەراپا بوویت بەدواین ویردی مەسیح

ئاخر ئەو هەموو گوناهەت بۆ هەبن ؟!

1995 – هەولێر






## ئەڕا پیاوێکی سوریالی

**((بۆ سلفادۆر دالی))**

ئاوێزانی دەستێکی بووم ، وامئەزانی

سەنتەری کەونم گرتووە

ئاوێزانی قاچێکی بووم

وەک ئەو منالەی کەهێشتا نەمبووە

گوناهێکی گەورەم کردو

بەپشتا لەسەر ئەو شیعرە پاڵکەوتم

گوناهێکی گەلێ گەورەترم کردو

پاشان لەنێو حەوزێکی شیندا دانیشتم

قاچەکانی ئەو پەرژینو دەستەکانی من

نیلوٚقەری سەر ئاوی ئاگر بوون

لەگەڵ ماسییە گەورەکە



بکوژترین مەلەمان کرد

لەگەڵ جووتە هەڵماتەکە

هاوارو ئاهەکانیشمان یاریی بوون

* تۆ چیت ئەی ساحیرترین پیاو

کەبەردەکان تەحەمولی پەنجەت ناکەن

کە گەڵای ئینجانەکانو

کاغەزەکانی نووسینو

جلی بەرمو رایەخی نێوماڵەکەشم

بەوێنەی قژی تۆ لوول بوون.

*کەدەمت نزیک گوێچکەم بوو

دەتوانی هەناسە نەدەی تانەمرم؟!

دەتوانی هاوینان کراسی قوڵ کورتو

زستان پاڵتۆ لەبەرنەکەی

بۆئەوەی شێت نەبم؟!

ناکرێ جگەرە نەکێشی‌و

لەبەرچاوم هەرگیز چەرخەکەت پێ نەکەی؟!

دەتوانی بەوجۆرە تۆنە بانگم نەکەیت

کەدڵی ئاو دەکا بە ئاو

بەوشێوازە سەیرم نەکەیت

کەگڕ لەئاگر بەردەدات؟!

*بۆئەوەی زۆر زۆر زۆر زۆرم خۆش نەوێی

پێم بڵێ بەسە

بۆئەوەی بڵێم بەڕاستی

بەختیاریی سەرابیی ترین ئەفسانەیە

لێم توورەبە.








ئێوارانێ

پێت دەڵێم تۆ حەزت لەپەڕینەوەیە!

گەروانییە، لەیەک ڕاستە شەقامدا بۆ

ئەو هەموو ئەمبەرو ئەوبەرەم پێ دەکەیت؟!

*لەسەوزایی بەهەشتی دیمانەیەکدا

پێت وتم مەڕێکی غەریب زۆر غەریب سەیرمان

دەکات‌و دەپرسێت:

چۆن گەڕانەوە پاش ئەوەی خوا فڕێیدانە سەر زەوی؟!

ئامادەش بووی حیکایەتی هاتنەوەمان

بۆ ئەو مەڕە باس بکەیت!

چەندە گەڕاین بەیەکەوە؟!

دیارە گەلێک





بەلأم خۆمان لەسێ شوێندا بەجێ هێشت

یەکەمیان: لەسەر ئەدگاری

کاتژمێرەکەی چێشتخانەی (داندۆک) و

دووەمیان: لەنەینووکی نێو جانتاکەمداو

سێیەمیان: لەرێگای بەهەشت.

ئێوارانێ

تۆ تەوقەکەی قژم ئەدەی لەسمێڵت و

دەمخەیتە پێکەنین!

جادە هەیە کەچی بەرێی خۆڵدا دەمبەیت!



دەرگا هەیە کەچی بەسەر دیواردا بازم پێ دەدەیت!

هەموو پیاوان گۆرەوییان لەپێدایە هەر تۆ نەبێ

هەموویان شتێ خراپی، ناشیرینییان تێدایە

هەر تۆ نەبێ

من بەهەموویان دەوێرم بەتۆ نەبێ.

*بەشەوگار بۆت دەنووسم ماڵەکەم

نهێنیی ترین ئەشکەوتە

نە T.V یەکی تیایە سەیری بکەم

نەرادیۆیەکی تیایە گوێی لێبگرم

نەمنداڵێکی تیایە لەگەڵ خۆمدا

شیرینی بۆ بهێنمەوە

نەپەنجەرەی تێدایە لێوەی بڕوانم

تا بزانم ئاخۆ رۆژەکەی هەتاوە یان هەورە

باخچەم نییە تا پیاسەی تێدا بکەم





جل دەشۆمو تەنافم نییە تا هەڵیانبخەم!

منێک کەناویان لێناوم خۆشەویستیی

نوێنم نییە بۆ میوان

منێک کەناویان لێناوم ئازایەتی

هەندێ جار بەدەست لێنانی چێشتێکەوە

دەستدەکەم بەگریان!

هەروەها

ئەم ماڵە ئەشکەوتە

سپێدەش ڕێگای پێنەدام گسکی بدەم

پێی وتم

ئاقڵ بە....

لەزەمانو دنیایەکی ناخاوێندا

ماڵی خاوێنت بۆ چییە؟!

بە ڕۆژگار بۆم دەنووسیت لەمێژە خۆشم دەوێیت!



*تۆ چیت ئەی ئاقڵ ترین پیاو

کەدەتوانی ئاسک هەروا بەئاسانی

رامبکەیت

کەقەناعەت بەپەپوولە دەکەیت

لەسەر شانەکانت هەڵبنیشێو

سوێند بخوات بڵێت تۆ گوڵیت.

هەولێر - 1995





*ئەڕا: وشەیەکی خانەقینییە واتا (بۆ)

*داندۆک:خواردنێکی میللیی هەولێرەو چێشتخانەیەکیش لە نەوەدەکاندا ناوی داندۆک بوو لەهەولێر.







## بەرد باشترە

شپرزەتر لەگەڵای سەر باڵی " با "
نائومێدتر لەمەودای نێوان گەردیلەکانی "خۆڵ "
شەهوەتبازتر لەنیگای "ئاگر "و
بێڕەنگتر لەفوستانی "ئاو "
ڕۆژەکان ڕەتئەبن .
بەرد باشترە ...
ژیانی مردووانەی ئەو سەنگینترە
لەقسەی ئەو فەیلەسوفانەی قەدەرێ
فریویانداین‌و بەتەنیا جێیانهێشتین !
حیکمەتیشی وەک قردێلەی خوێندکارێکی سەرەتایی
دڵبەرو سادەیە
ئەو کەویستی پیرۆز بێت وەچەی وەکو
بەردە قارەمانی شێخ‌و بەردە مۆرو
بەردە ڕەشەکەی پێغەمبەری خستەوە...



کەویستی نەمر بێت
بووبە میعمارو پەیکەرتاش
هەر بۆئەوەی بەدرێژایی ڕۆژەکە لەگەڵ کچان بێ
خۆی کرد بە بەردی هەڵماقۆو خەتخەتێن
توانی وا لە ژنان بکا ڕازی دڵیانی پێ بڵێن
بەرلەوەی بینێن بەگڵکۆی ڕزیووی پیاوچاکانەوە.
بۆئەوەی دەستی بگاتە مەزنیی پیاو
چووە سەر شانی سیزیفـو
کردی بەهێما بۆ عەبەس
لەڕاستیدا، بەردی سەبرو بەردی ڕجم‌و
بەردی ئەلحەدو بەردەباز برادەرن .
بەردی نیازو دەستاڕو یاپراخ‌و حەمام
دەستەخوشکی یەکترن.
جوگرافیای بەردینی ئێمە
حەقیقەتێکی سەرکێشی لەشاخزاوە
من دەمخواست نەوەی بوونێکی ئاویی بم

کە ژیانی لێ بڕژێ .

هەروەها کوژراوی بوونێکی هەوایم

کە تابڵێی مەزاجیی بێ .

شێتی بوونێکی ئاگریم

وەک هەموو ئەو پەرستگایانەی بۆ ئەبەد زەردەشتین .

جوگرافیای ئێمە بەردینە ..

بۆیە شیعرەکانمان پڕن

لەباس و خواسی ئەو دەریاو ناخوداو کەشتییانەی کە

نەمانبینین !

هەروەها یاخیشە ..

بۆیە گیرفانی مێژوومان لێوان لێوە

لەمێوژی شۆڕش و قوربانی

هەروەها کەللە ڕەقیشە ..

دیرۆکی ئێمە بەردینە








بۆیە خەونەکانمان بەکوشتار ئاوسن

من زەمان و خەڵکێکی نوێم ئەوێ

زەمانێ کەشاعیر بێت و

خەڵکێکیش کەشیعربن .

شەقامێکی دیکەم ئەوێ

کەسپێدە پێیدا رۆشتم

خەیاڵم لای جریووەو گمەبێ نەک لەلای تیرۆر کردنم .

لەبەرئەوەی شتێکی جیاوازم ئەوێ

بووم بەسێوێکی چاوەڕوان

تاقەتم چوو ..

ئەمەوێ بەعەشق بڵێم خودا حافیز

بەرد باشترێکە لەمرۆڤ

کردنی ئەو هەموو درۆو شەڕ و زوڵمە

وایلێکردم ئەوە بڵێم .

ئێمە تەنیا بەناوی عەشقەوە ئەکوژرێین





بەناوی خەباتەوە هەڵئەخەڵەتێین !

جورئەتمان هێندە بچووکە

جار هەیە لەنێو گیرفانی

بەرینی ترسنۆکیدا ون ئەبێتـو

ئەبین بە ئۆف

تاقەتم چوو ..

حەزئەکەم ئیدی بەژیان بڵێم شەو باش

من ئەمەوێ جیاببمەوە

مەرگـ باشترە لەمرۆڤ !!!

*        *        *        *

چوار بەردی تایبەتیم هەیە

کە بریتین لەبەردی "با "و

بەردی "خۆڵ "و

بەردی "گڕ "و

بەردی "ئاو "



( ا )

نا .. بەردی "با "

لەپای چی تۆ ئەم شەڕانە بەعەتری قژم ئەفرۆشی

قژێکـ کەماچی دەگمەنی ئازاترین شاسواری کوردی پێوەیە؟!

غرورم ئەتکوژێ

مەحاڵە، ناتوانی بمناسیت

ئۆقیانووسی نهێنییە گوڵییەکانی من بەرمۆداین

ئەز جیاوازم

زۆر جیاواز لەوانەی کە هەن، یان ئەبن

شەقژنی غەمگینم

تەسلیمە بە تەسلیم نەبوون .

( ب )

ئا .. بەردی "خۆڵ "

ماڵو مەنجەڵەکانمان خاڵین

ئەمیان لە سۆز ئەویان لە نان

ئەز کە ئەقڵم بەمەشکا ئیدی کوڵانم تەلاقداو

بووم بە ژن .

هەی لەوە .. !

لەنێوانی پەتپەتێنو

ئەو ژورناڵەدا کە ئێستا سەمای کاری تێدا ئەکەم

بەیەکچوون چەندە گەورەیە ؟!

ئەتوانم لەگەڵ بادانی هەر پەتێکدا

بێمەوە بۆلای مناڵیم

لەم ولاتە نەبوون بە چاوشارکێ ئەچێو

هەبوون بە ماڵە باجێنە

هەر هەموو شتەکان شینن

تەواو شینن

منداڵیشمان بەسۆزترین سەرخۆشییە .

( ج )







"بەردی گڕ" سەرچاوەکانی

لەنیشتمانی هەنگوینو عەشقەوەیە

کەچی لەنێو شەڕگەکانا

گورزی ئەو بکوژترینو تاڵترین زەڕبەیە

کتێبێک دەستی شەقاری زەمینی خوێندەوە

پێی وت: بەدبەخت

بەردی ئاگر مزمەعیلانە بەتۆدا گوزەر ئەکاتو

سەرئەنجام لەتئەبیت !!!

( د )

"بەردی ئاو" ئەڤینداریکی رۆمانسییە

جار هەیە جلێکی قەوزەیی ئەپۆشێو

ئەبێتە کلاوی هێلکەی ماسییەکان

قاچەکان لەسەر پشتی ئەخلیسکێنو

دەستەکان بۆیان ناگیرێ




ئەو بەردە ساف‌و لووسانە

بە ئاو ئەچن ...

بە پیاو ئەچن ...

بە ژن ئەچن ...

هەندێ جار بە ماسی ئەچن .

شپرزەتر لە هەناسەدانی باران

نائومێدتر لەپێکەنینی پڕ گریان

شەهوەتبازتر لە نووکی قەڵەم‌و

بێ ڕەنگتر لە کاغەز

وەرز‌و ساڵ‌و مانگەکان ڕەتئەبن.

من هەر تی‌نیام

لەبەرئەوەی بەرد باشترە لە شەهرەیار

لە شاسواری لوڕستان‌و

تۆ‌و فەرهاد‌و ڕۆستەمی زاڵ .

هەولێر – 1995





## فتوحات

شمشێری لە(با) یەو

قەڵغانی لە(ئاگر)

قامەتی لە(بەرد) ەو

رۆحی لە(ئاو)

زەمانی فتوحاتی ئەم، نیشتمان ئەبێت بە ((تەلا))و

پیاوانیش ئەبنەوە بە پیاو !

عەسرانێکی پرتەقاڵیی

ئەسپەکەی بەسەر بچووکیی ماڵە چڵکنەکانماندا

غارئەداتـو ئەڵێ: هەللاو

بەختیاریتان بەشئەدەم

ئەسپەکەی سپییە، کەحێلە، باڵدارە

چاوەکانی بەچاوی گا ئەچن

مەزاجیشی بە گوڵسارییە .*

ئەو شاسواری خەونی هەر هەموو ژنانەو





هێڵەکانی لەپی دەستی بەهێڵە زێڕینەکانی

دوا ژەنەراڵی دونیا ئەکەن !

ئەگەر ببینم پێی ئەڵێم: ئێوارەیەک

کچە شێتەکانی هاوڕێم

بەنزمترین تۆنی دەنگ باسیانکردی

هەموویان تۆیان بەهی خۆیان ئەزانیو

ئەیانوت ئاخ بۆ ساتێک لەگەڵ (ئەو)

ئەیانوت زۆر، زۆر جوانە

*گولساری:ناوی ئەسپەکەی پاڵەوانی رۆمانی ( وداعا غولساری ) جەنگیز ئەتیماتۆفەو بە مانای گوڵی زەرد دێت.

بەشاسوارێکی دەگمەنی ڕووسیی ئەچێ

منیش دەستم کرد بەگریانو دوعامکرد

کە ئەم شەڕە خەتەرناکە ببەیتەوە

زیاتر گریامو هیوام خواست

سەلامەت بیتـو بێیتەوە .





نیوە شەوێک

کچەکان وتیان خودایە

لەو هەموو عاشقو عەشقەی هاتنە ڕێمان

یەکێکمان لانەمایەوە خۆمان ڕەتیبکەینەوە

ئەو نەڕوا !

لەوهەموو غەزەلە، بەیتێکمان بۆ نەمایەوە

جۆلانەی تائی تەنیایمان ڕژەنیۆ

بەو هەموو جوانییەوە، توانای بەستنەوەی کەرێکمان تێدا نەبوو

ماسییەکمان پێ نەگیرا !

منیش وتم:

شمشێرەکەی لە ئاگرە

قەڵغانەکەی ڕەشەبایە

ڕۆحی بەردەو قامەتی ئاو

توورە بوونی ترسناکە، ترسناکە، ترسناک



کە پێکەنی شامی شەریفە دنیا !

دڵی نەرمە، بەئەندازەی نیوەڕۆیەک

کەلەسەر ئەژنۆ دانیشتو

فوستانە ئاودامانییە ڕەشەکەمی ئوتووکرد !

دڵی ڕقە ، بەئەندازەی سپێدەیەک

کەچەندان گوڵی بەکوشتداو

چەندەها دڕکو داڵی کوشت.

بەتەک کانیلەی ژیانو

لەپاڵ سەنگینترین زیخی چەمی نائومێد بوونەوە

وتم تازە، من تیاچووم (گۆزەکەم شکا)

بەسەر پشتی سیمرخەوە

پێی وتم ئەم فەتحەیانم لەچاوی تۆ

لەم گەشتە سەمەرەیەدا

ناخم پڕئەکەم لەمێژوو

جیمی جەستەم بەئاوی جوامێریی ئەشۆم

تۆ بەختەوەر ترین ژنی





لەبەرئەوەی من گۆزەتم !

مەوداکانی سەر سنگی نەخشەی بەرینی

رووناکبیریی ئێستامان شاری فەرهوودە !

شاعیرە دزەکان هاتن

پایزی (حەمە عومەر)و*

پەپوولەکانی دەربەندی (شێرکۆ) یان برد*

بالآی دەقە ژیرەکانی (بەختیار عەلی) یان لرفداو

(شین)و (با)و (ئاو)و (ئاگر)و

(بەردە) جوانەکانی منیشیان زەوتکرد

گۆرانیبێژە ساختەکان

*حەمە عومەر عوسمانی شاعیر خاوەنی شاکاری (لەغوربەتا) .

*مامۆستا شێرکۆبێکەس خاوەنی شاکاری (دەربەندی پەپوولە))

چریکە خۆشی (داریوش)و



دەروێشییان لە (بەهجەت) سەند*

ئەمە جیهانی دزان بوو ..عەزیزم

کۆجیتۆی درۆزنان بوو .. عەزیزم

بەداخەوە،

هێلکەکانی ئێمەش لەپاڵ

هێلکە پیسەکانی ئەواندا دانران

لەیەک زەمبیلەی ڕوانیندا

بۆ سبەینێ هەڵگیران !

ئەوەی کە من بەنیوەی تەمەنم سەندم

کچێکی تر، بەدەرخستنی لاسکی ستیانەکەی وەریگرت !

ئەمە تاڵترین نوکتەیە بۆ پێناکەنی عەزیزم ؟!

ئاه ..............

شمشێرەکەت لەکوێیە ؟!

قەڵغانەکەت و

قامەت و ڕۆحت لەکوێن ؟!

چەند پێویستی ..





چەند گرنگی ..

بۆ سەرەو ژێرکردنی ئەم وێرانەیەی

کە پێی ئەوترێ نیشتمان

تۆ چەند شیاوی بۆئەوەی

پاڵەوانێکی سوریالیی ئەم زەمەنە نغرۆیە بیت

ڕۆستەمی زاڵ .

*هونەرمەندی دەنگخۆش (بەهجەت یەحیا).

لەتەوقی سەری بێ قژی زەمینەوە

پێیداوەرە

تا قاچە بێ گۆرەوییە نەرمەکانی

هێڵی ئیستیوا وەکو ناوقەدم بگرەو

بڵێ هەر بەقەد ڕانێکمە !

زۆر درەنگە

ئەسپەکەت حیلاندیو

سەرجەمی بوون داچڵەکی



هاوارت کرد:

فتوحاتە، فتوحاتە ... فتوحات

ویستم بڕۆم

کەچی تۆ لەسەر ئاڵاکانت نووسی بوو

(من بەختەوەرترین پیاوم لەبەرئەوەی فاتحی تۆم)

لە کوێوە جۆگەیەک ڕاکێشین

ڕووەو پێدەشتی نادیاری قەناعەت ؟

یان بەکام دڵ

لە غەدری یەهودا خۆشبین ؟!

ژیان کابوس‌و پرسیار بوو ...عەزیزم

بەکام شەڕ ئەتوانین بیکەین بەشتێکی قەشەنگتر ؟!

زەمانێک‌و زەمەنێکی پێئەوێ ... عەزیزم

تا بوون لە جەللادی بوون‌و

شاعیر لە جەللادی شیعر







تەواو جودا بکرێنەوە .

پێی ئەوێت ... زۆری پێئەوێ

ئاه ... شمشێرەکەت لەکوێیە ؟

قەڵغانەکەت‌و قامەت‌و ڕۆحت لەکوێن ؟

لە کوێوە سەبر بهێنم

بەردی سەبرم

بوو بە هەزار پارچەوە !

هەولێر – 1995

**هۆلۆکۆست***

**(بۆ گوڵەکانی وەرزی ئەنفال**

**ئەو گوڵانەی لەبەهاردا هەڵوەرین)**

که بردیانن، لەدوا کەلی ئاوابوونا

ئەوکاتەی دەرفەتی ئاوڕدانەوەیەکیش نەبوو، وتیان ماڵئاوا

ماڵئاوا ئەی ماڵە وێران بووەکە، ئاوایی نائاوەدان

گوندە بچکۆلانەکەمان، ماڵئاوا...

ئەنفال جوگرافیای شوێنەکانی هەڵوەشاند

تابیابانمان پێ بناسێنێو

تراژیدیایەکی هاوبەش،

لەڕۆحە گوڵە کوژراوەکانی ئێمەو

جەستەی خۆڵە گەرمەکەی خۆی بخولقێنێ

ئەنفال ویستی،

بڵێ ئا ئەم گەردەلوولە ئیمانداراانە دەتوانن








نەوەیەک بەناخی زەمیندا ببەن و

بڵێن ماڵئاوا... میللەتە بێ ماڵەکان

بیابان تۆ دەلیلم بە

ئەم شەو و ڕێگاو غوربەتە غەریبن پێمو دەمێکە

چرای شیعرم کزکردووە، سەگەکانی نوگرەسەلمان پێم دەوەڕن

دەترسێمو باش نابینم

پارچەکانی جگەرم لەکونجوڕێکی ماڵە سووتاوەکەی تۆدا

لێ شوێن بزرو گۆڕبزرو شاهیدبزر کراوە

بیابان گیان...

تۆ کەتاکە شاهیدی حیکایەتەکەم

وەک حەیرانێکی پڕ سۆزی خەڵکی باشوور بۆ بڵێ

ئادەی بیڵێ... بەردەوام بە

یەکەم جارە هاوارە ئاوییەکانی شاخ

لەگەرووی وشکی بیابانەوە هەڵقوڵێن





بۆیە وادەنگت سازگارو غەمبارو خۆشە لەبەرگوێم.

کەبردیانن, نیشتمان وتی دیاربوونم

زادەی ونبوونی ئێوەیە بەقوربان

ئای هەموو ئامادەبوونێک خەراجی غائیب بوونێکە

ئای هەموو ئامادەبوون‌و غائیب بوونێک لەناو مندا مردنێکە.

ئالێرەوە... ئیدی ژنەکان بێ پیاو مانەوە

شەویان پۆشی‌و شوویان کردەووە بەچاوەڕوانی!

پیرەکان تەنیا خناوکەو کلکەوانەی یادەوەری

کیژو بووکە چاوڕەشە قسە خۆشەکانیان لەدڵدا هەڵگرت‌و

تووشی داوی زوڵفی لوولی گریانێکی بەردەوام بوون

سەیربوو ئەو ڕەوتی مێژووە زۆر سەیر

گەنجەکان گەنجینەی میراتیان بەجێهێشت

گەنجەکان ڕۆشتن‌و پیرەکان

لەکاکێشانی دۆزەخەوە بەپیاسە گەڕانەوە.

پونگەکانی ڕەنی باکووری خۆرهەڵات ڕاگوێزران



ڕووەو بیابانەکانی باشووری خۆرئاوا

کەنیلە گەرمیانییەکانی خوشکۆڵەی کافرۆشی

وەک کلی چاو فڕێنران

لەچاوترووکاندنێکدا، ئەم هەوارە

بێ غەزاڵ‌و شەنگەبێری مایەوە.

عەباکەی گوڵبەهار

لەچکەکەی زوڵەیخا

کەزییە سوورەکانی خاوەر

تایبابان با هێنانی‌و بردنی

تا بیابان لەرینەوەی ژێی زامەکان کوشتنی

نەعلی ئەو منالانەش هەر لێرە بەجێمان

کەهێشتا قۆخی نەگەیوو هەڵووژەی کاڵ بوون

ئەو کارمامزانەی هەرگیز، هەرگیز نایانبینینەوە

ئەو ساڵە ساڵی ئەنفال بوو ساڵی ئەنفال

ساڵی حەلاڵ بوونی خوێن‌و

ساڵی بەکۆمەڵ کوشتنی نەسلەکانی پەپوولە

وەزری قتکردنی ملی زراڤی شاخ

وەرزی درووێنەکردنی مەڕو ماڵات

وەرزی دزین

وەرزی غەزا

هەفتەی وەرین

هەفتەی بەیەکناساندنی (قەیس و لەیلا)-(فەرهاد و شیرین)

رۆژی کوێربوونی چاوەزار

سەعاتی سەرەوژێربوونی پێکەنینی تەنوورباو

سوعبەتەکانی کولێرە

ساڵی بەتەنیا مانەوەی پشیلەکان

وەک دووکەڵی پاش هەڵپروسکانی دێ

ساڵی ئەو موستەشارانەی کە تائێستاش

لەشەقامە بەرین و رەنگینەکاندا

کەلووتیان بوو بەلووتی سووتاومانەوە

پێمان دەڵێن قوربان گیان بەیانیتان باش!

ساڵی ئەنفال بوو ئەی هاوار ساڵی ئەنفال








ئەو ساڵەی کەدەموچاوی بەردەکانیش زەرد هەڵگەڕان

دارخورماکان وەک نەعامە سەریان دەخستە نێو لمی ساردو

لەرەگەوە دەیانناڵاند

چەرە دووکەڵ چاوەکانی سوبێری سەرابی دەچووزاندەوە

گوڵەکێوییەکانی خەونیشی دەکرد بەنوێژی بەتاڵ

کەبردیانن, هەمووشتێ بەرەو کاڵبوونەوە دەچوو

شۆڕش، رەوشت، ژیان، جوانی

قەسیدە وەک ملی ئەوان بەلادا کەوت

ئەو مێژووە... توانەوەی شەکری رووناکی بوو لەناو

ژەهراوی تاریکستاندا

تەسلیم بوونی گوڵەباخ بوو بەدڕکەزێ

حیکایەتی سەربڕاوی میللەتێکە زوو شتی لەیاد دەچێ.

هەولێر 1996/4/ 14







*لـــەزۆر لایەنـــەوە لەئەنفالـــەکانی لای خۆمـــان دەچـــێت, هۆلۆکۆسـت ئەوەیـە کـە لەجـەنگی جیهـانی دووەمـدا نازییـەکان لەئـەڵمانیا بەرامبـەر بەجولەکـەکان کردیـان, جیـاوازی لەگـەڵ ئەنفالە بەدناوەکەی کوردستان ئەوەیە قوربانیانی هۆلۆکۆسـت شەش ملیۆن کەس بوون.

* گۆڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی لەلایەن د.بەهرۆز جاف-ەوەو لە (الاتحاد) دا بلاْوکراوەتەوە.





## لەبۆت دەمرم
## هەولێرە ماست !

غەرییبت ئەکەم گوڵەباخ
ئەڵێی سەرابی دەست ڕائەکێشم‌و ناتگرم
هەنگاو ئەنێم‌و ناتگەمێ
غەرییبت ئەکەم، سەعات نۆ
بلیتێکی پاسی شەستیم بۆ وەرگرە
یادت بەخێر پاسی شەستی
چەند بەتام بوو خولانەوەی درێژخایانی ڕێگا
کە هەر ئەتوت سەفەرە بەرەو هەسارەی کاکێشان
چەند خۆشبوون تامی نیسکافیێو



تەعلیقی پیاوە کەنەفت‌و خەڵەفاوەکانی قەلاَ
یادت بەخێر ...
سێبەری پرچی درەختە عەیارەکانی گڵکەندو
هەتاوی ویستگە پیسەکەی بەرامبەر پەرلەمان
لۆت دەمرم گوڵەباخ
دڵم هەروەکو زەمبیلەی بن هەنگڵی
ژنەکانی شێخەڵلاَ کون کونەو
ئازارم وەک عەرەبانەی
کەرەستەی دۆڵمە ئەگەڕێ
من لەعەشقی تەنزەوە بوو پێم ئەوتی (هەولێرە ماست)
کەچی تۆ وەک بۆینباخەکەی هادی چاوشلی
بەردەوام هەر بە ویقار بووی
بۆیە سەری پەشێمانیم وەختە دوو شاخی لێ بڕوێ
تازە ئیدی
گوڵەکانی سلێمانی‌و تاران‌و ئەنقەرە بەمن چی
کەهیچیان بۆنی پەنا گوێێ

گوڵەکەی خۆمیان لێ نایە

یارو دیارم چەند دوورن

وەرزی دڵم چەند تەنیایە .

( سێو پێگەیی نەهاتم، کە لیمۆ زەرد بوو هەرنایەم

نەخۆش کەوتی نەهاتم وادەی ڕۆحکێشان قەت نایەم )

غەریبیت ئەکەم ئێوارەی

ڕۆژێکی دیکەش ئەچین بۆ عەنکاوە

غەریبیت ئەکەم تۆ بڵێی

مەغریبی ساتێکی دیکەیش

بۆ سەیری بەهەشتە سەیرە هەڵواسراوەکانم بەری و

لەلای (هەدلە) دوو قاوە بگرینەوە ؟!

قەلەندەر خۆمان گوڵەباخ

هێڵی سەعاتەکان باڵن

بڕوانە زەمەن چۆن چۆنی پێیان ئەفڕێ

ئاوڕێک ناداتەوە،







نامەیەک نانێرێ !

ژیانی ئێمە بێ باکە

وەک بێ ئاویی گەڕەکی عارەبان

نامورادە وەک شەقامی کۆتر سەلام

ئاه ... خودایە

یارو دیارمان چەند دوورن

وەرزی دڵمان چەند تەنیایە .

1996 – کرماشان





## بەفری کافر

ئەم نیشتمانەی ئێمە هەڤاڵی مەگە

بڕوانە چ ئاوەدانییەک، کەوتۆتە گۆڕستانییەوە

مانگمان فریای ناشتنی مانگمان ناکەوێ

گوڵمان بەدیار تەرمی گوڵەکانمانەوە

هەنیسکی پێنەما

دەریای فرمێسکی ژنانیش بوو بەقاقڕ

کەچی تازە ئەبەنووس دێو

بەڕەنگی بەفری شەهیدم ئەڵێ کافر



تازە بەتازە دەستی شەڕ یەخەی لق و پۆپم ئەگرێو

بەنووری هەتاوەکانی دڵیشم ئەڵێ مونافیق

چ وێرانییەک هاتۆتە مەنزڵگاو دیارمانەوە

چ عەشق و ئازایەتییەک پارێزگاریمان لێ ئەکات

بۆنی خاکی پاش باران بکە ئەزانی

بۆنی شەهید چەندە خۆشە .

گوێ لەناڵەی ئاتەش بگرە

ئەزانی لەناو هەناوی دایکی شەهیدەکانمانا

چ هەنگامەی ئازارێک و چ کەرنەڤاڵی ژانێکە

کۆتایی بۆنییە جگەر سووتانم ... کۆتایی بۆنییە ...

تراژیدیای تەعزێکان و کۆمیدیای ئاهەنگەکانم

کۆتایی بۆنییە، بەرین بوونی دارەمەیت و

تەسک بوونەوەی پەنجەرەو

دەروازەی هەناسەدانم

من چەند گیرۆدەی ئازادیم

ژیان لەمەرگ ئەخوڵقێنم

چرا لەبرینەکانم .

کۆتایی بۆنییە ... سەرەتای بۆنییە

نێوەندی نییە دیرۆکی ماڵی ئەنفال

ماڵی کیمیابارانو ماڵی هەڵەبجەی بریندار .

چ خۆڕاگرییەک هاتە،هۆدەکانی گیانمانەوەو

چ تاریکیو تەسلیم بوونێک هاتە دەرێ

لەگوڵبێنەی چاوەکانو تەنووری کەپوومانەوە

هەر دڕکێک بکوژرێ، هەر درەختێ شەهید بکرێ

پرسە پرسەی نیشتمانەو

زێمار زێماری خاکێکە بەبێ مەبەست

دڕکو درەختی لێ ئەڕوێ .

چ شەڕێک هاتە نێو دێڕی شیعرمەوەو

چ ئاشتییەک بەئاسمانەکانیا فڕی

کە دەمە دەمی بەیانێ بانگم هەڵدا

من لەگەڵ بەفری کافرم

لەگەڵ هەتاوی کافر







لەبەرئەوەی ئەزانم بەفر ئاشتییەو

کوفریش شەڕێکی یەخەگر

کۆتایی بۆ نییە ... قەسیدەی شەهید

کۆتایی بۆنییە ... نەمریی ئاگر .

سلێمانی – 1994

